سەردەمی گوڵین - ١

حەزرەتی

# محمد

صلى الله علیه وسلم

موستەفا ئەردۆغان








زنجیرەی
سەردەمی گوڵین
١

# حەزرەتی محمد
صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ

نووسینی: موستەفا ئەردۆغان
وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
چاپی یەکەم: کانوونی دووەم - ٢٠١٣ تیراژ: ٥٠٠٠
چاپی دووەم: ئەیلول - ٢٠١٣ تیراژ: ٥٠٠٠

شوێنی چاپ
Neşe
Neşe Matbaacılık - İstanbul - TURKEY
+90 212 886 83 30
www.nesematbaacilik.com

دیزاینی ناوەوە: دۆستی مێدیا - هەولێر - ٠٧٥٠١٨٥١٥١٥



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
www.irfanpublishing.com

# ناوەڕۆک



ئەستێرەیەک لەدایک بوو ١



دایکی شیری ٦

ئەو دڵەی بە بەفراو شۆردرایەوە ١٩

خەمی دایک ٢٢

جیابوونەوەکان ٢٥



له ڕێگای "شام"دا ٢٨

هاوسەرگیری ٣٥

بەردە ڕەشەکە ٣٩

تەنهایی ٤٣



ئەشکەوتی حیرا ٤٥

حەزرەتی عەلی ٥٤

حەزرەتی ئەبوبەکر ٥٨

کۆیلە ٦٣



بانگهێشت کردن ٦٧



لە پەیامەکەم
پاشگەز نابمەوە ٧١



مانگ دەبێت
بە دوو کەرتەوە ٧٧


مۆرانه ٨١

میعراج ٨٧



کۆچ ٩٦

کۆتر و جاڵجاڵۆکه ١٠٢



له مەدینە ١٠٧


کاروانە بازرگانییەکە ١١٢

چەند کەس ١١٥


گردی
تیرهاوێژەکان ١١٩



تاشه بەردەکە ١٢٧



فەتحی مەککە ١٣٠

حەجی ماڵئاوایی ١٣٥

دوا نوێژ ١٣٨

بەیەك گەیشتنەوە ١٤١

خدم ١٤٤

# ئەستێرەیەك لەدایك بوو

مانگی نیسانی ساڵی ٥٧١ ی زاینی بوو، بەیانی ڕۆژی دووشەممە، ڕووناکییەك ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای گرتەوە.

ئەو ڕۆژە، کۆمەڵە ڕووداوێکی سەرنجڕاکێش یەك لەدوای یەك ڕوویاندا. ئەو بتانەی کە لە کەعبەدا بوون کەوتنە سەر زەوی. ئەم ڕووداوە سەرنجی مرۆڤایەتی بەلای خۆیدا ڕاکێشا. ئاخر بتێك کە جێگیر کرابێت چۆن دەبێت لەخۆیەوە بکەوێتە سەر زەوی؟! لە دووری چەندین کیلۆمەترەوە لە ئێران ڕووداوێکی تر ڕوویدا. کیسرای پاشای فارس بە زەمین لەرزەیەکی بەهێز لە خەو ڕاپەڕی. ویستی بزانێت چی ڕوویداوە. پاسەوانەکانی زۆر ترسابوون، تا بەرەبەیان نەیانوێرا هیچ بە پاشا بڵێن. دەمەو بەرەبەیان بەترسەوە وتیان:

- پاشای گەورە، چواردە پایەی کۆشکەکە تەفروتونا بوون.

تەنها خولەکێکیش بەسەر ئەم ڕووداوەدا تێنەپەڕیبوو کە لە کۆڵانەکانی ئێراندا دەنگە دەنگ و هاوارێکی زۆر بەرزبوویەوە:

ئاگرەکە کوژایەوە.. ئاگرەکە کوژایەوە!

خەڵکی باوەڕیان بە گوێی خۆیان نەدەکرد. ئەو ئاگرەی هەزاران ساڵە پەرستویانە و تەنانەت بڵێسەکەشی کەمی نەکردوە، لەناکاو کوژاوەتەوە!

دانیشتوانی ناوچەیەکی تریش ڕووبەڕووی ڕووداوێکی سەیر بوونەوە. خەڵکی "ساوا"، ئەو ڕووبارەی کە بە پیرۆزیان دەزانی لەناکاو زەوی هەڵیمژی و چەندین تۆن ئاو بەناو زەویدا ڕۆچوو. ئیتر بەمجۆرە ئەوانیش لەو ڕووبارە بێ بەش بوون کە بە پیرۆزیان دەزانی. بەڵێ، هەموو ئەمانە بە بەرچاوی خەڵکییەوە ڕوویاندا و کەسیش هۆکاری ئەمانەی نەدەزانی.

ئەوانەی ئەو شەوە تەماشای ئاسمانیان دەکرد زۆر سەریان سووڕمابوو.

- تەماشاکەن، تەماشای ئەوێ بکەن، وا ئەستێرەکان بەدوای یەکدا دەکشێن!

- شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەرە. ئاوا بڕوات ئەستێرە لە ئاسماندا نامێنێت!

بۆ بەیانی دواتر، لە پشتی گردەکانەوە ڕۆژ هەڵهات. لە ماڵی خاتوو "ئامینە"شدا جووڵەیەك بەدی دەکرا. ئافرەتێك بەرەو کەعبە ڕایکرد و خۆی گەیاندە لای عەبدولموتەڵیب و، وتی:

- مژدە بێ لێتان! نەوەیەکی کوڕتان بوو.

عەبدولموتەڵیب بە بیستنی ئەم مژدەیە ڕووی گەشایەوە. خێرا هەستایە سەرپێ و بەرەو ماڵ کەوتە ڕێ. کاتێك چاوی بە کۆرپە بێنازەکەی عەبدوڵڵا کەوت، یەکسەر لەباوەشی گرت. ئای چەندە منداڵێکی ڕووخۆش و شیرین بوو! بەردەوام پێدەکەنی. عەبدولموتەڵیب دەیووت:

- بەدڵنیاییەوە ئەم کوڕە بچکۆلەیەم دەبێت بە کەسێکی گەورە و ناودار.

خاتوو ئامینەش دەستی کرد بە گێڕانەوەی ئەو خەونەی کە لە کاتی دووگیانیدا بینیبووی. لە خەونەکەیدا یەکێك پێی وتبوو: "بزانە کە تۆ سەرداری جیهانیانت لە سکدایە. کە لەدایك بوو، ناوی بنێ موحەممەد و لای کەس باسی مەکە." هەر بۆیە دایە ئامینە ناوی منداڵەکەی نا "موحەممەد".

عەبدولموتەڵیب کوڕەزاکەی لە باوەش گرت و بەرەو کەعبە بەڕێکەوت. لەوێ زۆر دوعای کرد و سوپاسی خوای کرد. دواتر گەڕایەوە و منداڵەکەی خستەوە باوەشی دایکی.

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەستی کرد بە شیر خواردن. بەڵام دایە ئامینە شیری نەبوو. بیریان لە چارەسەرێك کردەوە بۆ ئەمە. خێرا خاتوو ثوەیبەی دایکی شیریی حەزرەتی حەمزەیان بانگکرد. منداڵەکەیان خستە باوەشییەوە. پێغەمبەرمان ﷺ بۆ یەکەمجار شیری ئەو ژنەی خوارد. بۆیە لە هەمان کاتدا لەگەڵ حەزرەتی حەمزەی مامیدا بوون بە برای شیری.

*** 



## دایکی شیری

ئاسمان شینێکی تۆخ بوو. جگە لە خۆر و چەند پەڵە هەورێکی سپی جوان، هیچی تر بە ئاسمانەوە نەبوو. خەڵکی "بەنی سەعد" سەرقاڵی خۆئامادەکردن بوون بۆ ڕۆژێکی نوێ.

بە تێپەڕبوونی چرکەکان، جووڵەی ناو مەیدانەکان ڕوویان لە زیادبوون دەکرد. خەڵکی، وشتر و ماین و گوێدرێژەکانیان لە گەوڕەکان دەهێنایە دەرەوە.

لەژێر سێبەری دارخورمایەکدا وشترێکی پیر چۆکی دادابوو. ئاژەڵەکە بەڕادەیەك لاواز بوو کە سەرنجی دەروبەری بەلای خۆیدا ڕادەکێشا. تەنانەت لە دووریشەوە ئێسکەکانی سنگی یەك بە یەك دەژمێردران.

لە ماڵەکەی بەرامبەر دارخورماکانەوە دەنگی گریانی منداڵێك دەهات. ئافرەتێکی بەساڵاچوو هەوڵیدەدا کە ژیری بکاتەوە. بەڵام ژنەکە چەندێك هەوڵی بدایە ژیری بکاتەوە، منداڵەکە زیاتر دەنگی بەرزدەکردەوە.

پیاوێکی پیر، بەڕوخسارێکی خەمگینەوە لە دەرگای ماڵەکە هاتە دەرەوە و بەرەو لای وشتری ژێر دارخورماکە ڕۆیشت. لەگەڵ پۆشینی پۆشاکەکەیدا لەبەر خۆیەوە ورتە ورتی دەهات و، دەیووت:

- ئەم نەبوونییە تاکەی؟ منداڵ برسی، دایك برسی، ئاخر ئەگەر شتێك نەبێت دایك بیخوات، چۆن شیری خۆی بدات بە منداڵەکەی؟

پیاوەکە هاتە لای وشترەکە و سەیرێکی گوانی کرد، بەڵام هیچ شیری تیانەبوو. بە خەمبارییەوە گەڕایەوە. ڕۆیشتە ژوورەوە و ڕووی کردە هاوسەرەکەی کە لە سوچێکدا خەریکی ژیرکردنەوەی منداڵەکەی بوو، پێی وت:

- بەداخەوە، وشترەکە ئەوەندە شیری تیا نییە کە تەنها بەشی تۆش بکات.

ژنەکە تەماشایەکی چاوی مێردە بێچارەکەی کرد و، وتی:

- تۆ بڕۆ هەرچەندێك هەبوو بیهێنە، ئەگینا عەبدوڵلا بە درێژایی گەشتەکە بێدەنگ نابێت.

پیاوەکە قاپێکی هەڵگرت و دووبارە بەرەو لای وشترەکە ڕۆشتەوە. زۆری پێنەچوو گەڕایەوە. ئەو تۆزە شیرەی لە بنی قاپەکەدا هێنابووی، خستیە سەر ئاگرەکە. چاوەڕێی گەرمبوونەوەی شیرەکەیان دەکرد. پیاوەکە ڕووی کردە هاوسەرەکەیی و، وتی:

- حەلیمە دەبێت خێرا بەڕێکەوین، دراوسێکانمان دەستیانکردووە بە ئامادەکردنی ئاژەڵەکانیان. نابێت لەوان دوابکەوین، ئەگینا هیچ منداڵێکمان بۆ نامێنێتەوە تا بیهێنین و بەخێوی بکەین.

ژنەکە بەدەم ژیرکردنەوەی منداڵەکەیەوە بە نائومێدییەوە وتی:

- ئەگەر بیشیدۆزینەوە چی دەبێت حاریث؟! تەماشاکە! ئەوەندە شیرم نییە بەشی منداڵەکەی خۆمان بکات. جا لەبەر چی ئەویش بچەوسێنمەوە. ئەم منداڵە داماوە لەبرساندا لە شەوەوە نەنوستووە، تۆ بڵێی ئەو منداڵەی دەیهێنین حاڵی لەم باشتر بێت؟

پیاوە بێچارەکە کەمێك بە بێدەنگی مایەوە. کە شیرەکە گەرمبوو، کردیە قاپێکەوە و بردی بۆ هاوسەرەکەی:



- دەی حەلیمە ئەمە بخۆرەوە، تا تۆ ئەمە دەخۆیتەوە، منیش ئاژەڵەکە ئامادە دەکەم.

کە حاریث چووە دەرەوە، حەلیمە قاپەکەی برد بۆ لێوەکانی. زۆری پێنەچوو کاروانەکە کەوتە ڕێ و خەڵکی بەدەم قسەکردنەوە لە مەککە نزیکبوونەوە. پاش ماوەیەك ئافرەتێکی گەنج ئاوڕی دایەوە و، وتی:

- حەلیمە زۆر لە دواوەوەن، دواکەوتوون!

حەلیمە بە بێزارییەوە سەیرێکی گوێدرێژەکەی ژێری کرد، حاریثیش بە دارەکەی دەستی کێشای بە پشتیدا و، وتی:

- دە تۆزێك برۆ، چی دەبێ؟!

گوێدرێژەکە تۆزێك خێراتری کرد. بەڵام پاش کەمێك گەڕایەوە سەر باری پێشووی خۆی.

خەڵکەکە گەیشتنە مەککە، بەڵام حەلیمە و حاریث زۆر لە دواوەوە بوون. تا ئەمان گەیشتنە دەروازەی مەککە، ئەوان یەکە بە یەکەی ماڵەکان گەڕابوون. دەوڵەمەندەکانی مەککە، منداڵەکانی خۆیان بە ئامانەت دەسپارد بەوانەی هاتبوون و، دەیانووت:

- ئامان! بەباشی ئاگاتان لە منداڵەکەمان بێت. با لە گەرمای مەککەدا گەورە نەبن، بەڵکو لە ناوچە فێنکەکانی ئێوەدا پێبگەن. بە باشی فێری زمانەکەمانیان بکەن، هیچ خەمی خەرجیتان نەبێت. ئێوە تەنها منداڵەکەمان بە باشی پەروەردە بکەن، ئیتر هەرچییەکتان ویست، بەزیادەوە پێتان دەدەین.

ئەوانەش کە هاتبوون بە شێوازێك کە متمانەیان پێبکەن، دەیانووت:

- هیچ خەمتان نەبێت، جیاوازی ناکەین لەنێوان منداڵی خۆمان و منداڵی ئێوەدا. هەروەکو چاوی خۆمان دەیانپارێزین و ئاگاداریان دەبین.

لەکۆتاییدا حاریث و خێزانەکەشی گەیشتنە مەککە. ماندووبوونیان لە لایەك و دواکەوتنیان لە کاروانەکە لەلایەکی ترەوە تەواو بێزاری کردبوون. ئیتر تەواو بێ ئومێد بووبوون لەوەی کە خێزانێکی دەوڵەمەند بدۆزنەوە. دایان لە دەرگای یەکەم خانوو کە پێی گەشتن. هەروەك ئەوەی چاوەڕوانیان دەکرد، وەڵامیان دەدایەوە و، دەیانووت:

- ببوورن! منداڵەکەمان ڕادەستی خێزانێك کرد کە پێش ئێوە هاتن. لە دەرگایەکی تریاندا، دیسانەوە هەمان وەڵامیان وەرگرت. ئەو بارەی کە تێیدا بوون هیچ دڵخۆشکەر نەبوو. وەك ئەوەی هەموویان لە نێوان خۆیاندا ڕێککەوتبێتن، هەمان وەڵامیان دەدایەوە. حەلیمە بەرگەی ئەو حاڵەی نەدەگرت. زۆر ماندوو بووبوو. منداڵەکەی تادەهات لە باوەشیدا قورستر دەبوو ، بۆیە دای بە مێردەکەی و، وتی:

- تۆ لێرە چاوەڕێم بکە!

ئەمەی وت و خۆی دەستی کردەوە بە گەڕان. کاتێك لە نزیك کەعبە دەگەڕا، چاوی بە پیرەمێردێکی بەساڵاچوو کەوت.

بێ ئەوەی هۆکارەکەی بزانێت، لە شوێنی خۆیدا وەستا. بە وردی تەماشای پیاوە بەتەمەنەکەی کرد. ئەم کابرا بەتەمەنە ڕۆح سووکە، جگە لە عەبدولموتەڵیب کەسی تر نەبوو. عەبدولموتەڵیب هەستی کرد لێی دەڕوانێت. بۆیە ڕووی تێکرد و، لێی پرسی:

- کچم، تۆ لە چ هۆزێکی؟

حەلیمە خاتوون خۆی پێناساند و باسی ئەوەی بۆ کرد کە بۆچی هاتووە بۆ ئێرە. عەبدولموتەڵیب بە زەردەخەنەیەکەوە وتی:

- ئەی حەلیمە! من لەماڵەوە منداڵێکی بێباوکم هەیە. تکام لە هاوەڵەکانت کرد، بەڵام کەسیان ڕازی نەبوون ببن بە دایکی شیریی ئەو. وەرە تۆ ببە بە دایەنی ئەو. ئومێد دەکەم کە بەهۆی ئەوەوە خێر بێتە ڕێت.

حەلیمە کەمێك بیری کردەوە. ئەو بۆلای خێزانە دەوڵەمەندەکانی ئێرە هاتبوو. لەو باوەڕەدا نەبوو ئەو منداڵە بێباوکەی ئەو پیرەپیاوە باسی دەکات، سوودێکیان پێبگەیەنێت. لەم حاڵەدا چۆن دەیانتوانی بەو هەژارییە ژیان بگوزەرێنن؟! بەڵام هیچ منداڵێکی تر لە مەککەدا نەمابوو. نەشیدەویست بە دەستی بەتاڵ بگەڕێتەوە... بە دوودڵییەوە تەماشایەکی عەبدولموتەڵیبی کرد و، وتی:

- با پرسێك بە مێردەکەم بکەم!

خێرا چوو بۆلای حاریث و بابەتەکەی بۆ باسکرد:

- هیچ منداڵێکم نەدۆزییەوە و ناشمەوێت بەدەستی بەتاڵ بگەڕێمەوە ناو هۆزەکەم. ئەمەوێت ئەو منداڵە بهێنم.

حاریث هیچ شتێکی لە تواناادا نەبوو بیکات. بۆیە سەری داخست و بە ئومێدی ئەوەی ڕۆژێك گوزەرانیان باشبێت، وتی:

- خۆت دەزانی حەلیمە، بەڵکو خوای گەورە بەهۆی ئەو منداڵە بێباوکەوە بەرەکەت بڕێژێ بەسەرماندا.

حەلیمە خێرا گەڕایەوە و عەبدولموتەڵیبی دۆزییەوە و پێی وت کە داواکەی پەسەند کردووە. عەبدولمەتەڵیب زۆر دڵی بەوە خۆش بوو. پێکەوە بەرەو ماڵەوە بەڕێکەوتن.

دایکە ئامینە بە ڕوویەکی گەشەوە بەخێرهاتنی کردن. کاتێك زانی حەلیمە دایەنە، فەرمووی لێکردە ژوورەوە. حەلیمە خاتوون لەگەڵ یەکەم هەنگاویدا، هەستی بە بۆنێکی زۆر خۆشی میسك ئاسا کرد. بە سەرسامییەوە دەگەڕا بەناو خانووەکەدا و چاوی دەگێڕا، لە سوچێکدا بێشکەیەکی بەدیکرد. لەو کاتەدا خورپەیەك بە دڵیدا هات و بە جۆش و خرۆشێکی زۆرەوە بەرەو لای بێشکەکە هەنگاوی نا. لەگەڵ هەر هەنگاوێکیدا بۆنە خۆشەکە زیاتر دەبوو.

کە گەیشتە لای بێشکەکە، کەوتە سەرچۆك. لەوکاتەدا کە دەستی بۆ بێشکەکە درێژکرد، هەستێکی زۆر جیاواز ناخی تەنی. لە کۆتاییدا پەردەکەی لابرد و چاوی بە منداڵێکی ڕوخسار شیرین کەوت.

لەژێر منداڵەکەدا پەڕۆیەکی سەوز داخرابوو، قوماشێکی سپیش درابوو بە سەریدا. دەموچاوی ئەوەندە سپی و جوان بوو، خاتوو حەلیمە لە تەماشاکردنی تێر نەدەبوو. لەو کاتەدا ئامینەی دایکی کە لە پاڵیاندا وەستابوو، ناوی منداڵەکەی وت:

- موحەممەد

خاتوو حەلیمە هەستی بە ئاسوودەییەکی زۆر کرد. بەبێ هەناسەدان و چاو تروکاندن تەماشای منداڵەکەی دەکرد، جیاواز لە

منداڵانی تر، یەك پارچە نوور بوو. خۆی پێنەگیرا و منداڵەکەی لەباوەش گرت. لەو کاتەدا موحەممەدی شیرین وردە وردە چاوە بچووکەکانی دەکردەوە. تاسە و شەیدایی حەلیمە زیادی کرد. بۆی پێکەنی و منداڵەکەش دەستی کرد بە پێکەنین. حەلیمە بڕیاریدا هەر لەوێدا شیر بە منداڵەکە بدات. مەمکی ڕاستی خستە دەمی منداڵەکەوە، بەڵام کەوتە گومانەوە و لەبەر خۆیەوە وتی تۆ بڵێی شیری لێبێت؟!

لە یەکەم ساتدا کە منداڵە شیرینەکە شیری وەرگرت، حەلیمە لە دوودڵییەکی زۆردا بوو. بەڵام کە لە ڕوخساری منداڵەکەی باوەشی ڕوانی، بینی دەمی منداڵەکە پڕبووە لە شیر و شیر دەخوات.

چەندە سەیرە! حەلیمەی حەپەساو تەماشایەکی ئامینەی کرد. ئامینە بێئاگا بوو لە هەموو شتێك، بۆ خۆی لە نووری چاوانی دەڕوانی. پاش کەمێکی تر لە منداڵەکەی جیا دەبووەوە، بۆیە لە چاویدا ئازاری ئەو لێکدابڕانە بەدی دەکرا.

دەبێت بیری لەوە کردبێتەوە کە چۆن دەتوانێت بەرگەی دووری ئەو بگرێت؟!

پاش کەمێك بۆ ئەوەی ماڵئاوایی لە ئامینە بکات، حەلیمە هەستایەوە. ئامینەی دایکمان دڵی پڕبووبوو. حەلیمە پێی وت:

- دڵنیابن لەوەی کە وەك منداڵی خۆم چاودێری منداڵەکەتان دەکەم.

ئامینه بە چاوی پڕ لە ئەسرینەوە ماڵئاوایی لە منداڵە تاقانەکەی کرد. خاتوو حەلیمە بەدەموچاوێکی گەش و زەردەخەنەوە گەڕایەوە لای مێردەکەی. حاریث تەواو لە ژێرکردنەوەی منداڵەکەی باوەشی ماندوو بووبوو. کە هەستی بە دڵخۆشیی خێزانەکەی کرد، کەوتە گومانەوە. کە دەموچاوە نوورانییەکەی منداڵەکەی باوەشی بینی، هۆکاری دڵخۆشییەکە تێگەیشت. خۆیشی هەر کە منداڵە ڕوو گەشەکەی بینی، دڵی کرایەوە. سۆزی بۆی جوولاً و خۆشەویستی کەوتە دڵییەوە.

ئەو شەوەیان لە نزیك مەککە بەسەربرد. حەلیمە لە یەك کاتدا شیری دەدا بە عەبدوڵڵای کوڕی و بە فەخری کائیناتیش. هەردوو منداڵەکە تا تێربوون شیریان خوارد.

دواتر حەلیمە ویستی شوێنی دوو منداڵەکە بگۆڕێتەوە. پێغەمبەری خۆشەویستمانی خستە لای چەپی، بەڵام شتێکی سەرنج ڕاکێشی بینی. پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ لەو لایەی نەدەخوارد. حەلیمە دووبارە خستییەوە لای ڕاست، خۆشەویستمان دەستی کردەوە بە شیرخواردن.

عەبدوڵڵای بچکۆلە، بەو بەرەکەتەی بەهۆی برا شیرییەکەیەوە بۆی هاتبوو، یەکەمجار بوو کەوا تێرشیر ببێت. ئەو شەوە بە سکی تێر و بە خەوێکی بێ پچڕانەوە پێشوازی لەڕۆژێکی نوێ کرد.

کە ڕۆژ بووەوە حاریث هەستا لەخەو. یەکسەر بەرەو لای وشترەکە ڕۆیشت. زۆری پێنەچوو بە سەرسووڕماوی گەڕایەوە لای حەلیمە و تا لێواری قاپەکە شیری هێنابوو. پیشانی حەلیمەی دا و، وتی:

- حەلیمە، تۆ میوانێکی پیرۆزت هێناوە بۆ ماڵەکەمان!

لە دوای ئەو ڕۆژەوە، ئەو وشترە پیرەی شیری نەبوو، بوو بە "کانی"یەکی شیر.

خۆیان ئامادە کرد بۆئەوەی بگەڕێنەوە ماڵەوە، پاش کەمێك کەوتنە ڕێ. حەلیمە هەردوو منداڵەکەی لە باوەشدا بوو، سواری گوێدرێژەکە بوو. ئەو گوێدرێژەی کە لەکاتی هاتنیاندا بە گرانی هەنگاوی دەنا، ئێستا وەك هەورەبروسکە دەڕوات. بە ماوەیەکی کەم پێش کاروانەکە کەوت، ئەوانەش کە لە دواوەوە بوون زۆر سەریان سووڕمابوو. حەلیمە و حاریث نهێنی ئەم شتەیان دەزانی. ئەو منداڵەی لەگەڵیاندا بوو، منداڵێکی ئاسایی نەبوو.

لەکۆتاییدا گەیشتنەوە ماڵەوە. لە دوای ئەو ڕۆژەوە حاریث و خێزانەکەی ژیانێکی زۆر خۆشیان بەسەر برد. ئاژەڵەکانیان تێر دەلەوەڕین و لە ماوەیەکی کەمدا قەڵەو دەبوون، تەنانەت کەوتنە شیردانیش.

دراوسێکانیان کە ئەمەیان دەبینی، دەکەوتنە دەنگە دەنگ لەگەڵ شوانەکانیان:

- ئەوە چییە حاڵی ئەم ئاژەڵانەی ئێمە؟ بۆچی وا لەڕ و لاواز و بێ شیرن؟

ئەوانیش دەیانووت:

- سوێند بێت، ئەوەی لەتوانامانداية دەیکەین و لە باشترین شوێندا دەیانلەوەڕێنین.

- دەی کە وایە مەڕەکانی حەلیمە بۆچی وەها پڕ شیر و قەڵەون، ئێوە چ شوانێکن؟ لەمەولا شوانەکەی حەلیمە لەکوێ مەڕی لەوەڕاند، ئێوەش دەبێت لەوێ بیلەوەڕێنن. دەبێت مەڕەکانی ئێمەش وەکو مەڕەکانی ئەوان بێت.

شوانەکان زۆر سەریان سووڕمابوو. لەو ساتەوە چاودێری شوانەکەی حەلیمەیان دەکرد. ئەو لەکوێ مەڕی بلەوەڕاندایە، ئەوانیش لەوێ دەیانلەوەڕاند. بەڵام هیچ شتێك نەگۆڕا، جگە لە حاریث و حەلیمەش کەسی تر لە نهێنی ئەمە تێنەدەگەیشت.

خوای گەورە بەرەکەتێکی زۆر زۆری ڕژاندبوو بەسەر ئەوماڵەدا کە خۆشەویستی خوای لێبوو.

چەندین مانگ تێپەڕبوو. سەروەرمان ﷺ بە خێرایی گەورە دەبوو. کە بوو بە دوو ساڵ، حەلیمە گرتی بەباوەشیەوە و بەرەو مەککە کەوتە ڕێ. هاتبوو فەخری کائینات پێشکەش بکاتەوە بە دایکی.

خاتوو ئامینە کە منداڵەکەی بینی هەستی بە خۆشییەکی بێ وێنە کرد. گرتیە باوەشییەوە و تێر بۆنی کرد. پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ زۆر دڵخۆش دیار بوو.

عەبدولموتەڵیبیش هات. نەوەکەی کە لە تەمەنی دوو مانگیدا بینیبووی، ئەوە ئێستا بووە بە دوو ساڵ. زۆر دڵی پێی خۆشبوو. ئەویش گرتییە باوەش.

حەلیمە نەیدەویست لە منداڵە شیرییەکەی جیاببێتەوە. ئەو منداڵە خۆشەویستە، خۆشی و بەرەکەتی هێنابووە ماڵەکەیانەوە. بەدڵەڕاوکێوە تەماشای ئامینەی کرد و، وتی:

- چی دەبێت ئەگەر ماوەیەکی تریش منداڵەکەتان لای من بمێنێتەوە؟!

دایکە ئامینە بۆ ماوەیەك وەستا، نەیدەزانی چی بڵێ. حەلیمە بەردەوام بوو لە قسەکانی و، وتی:

- دەترسم تووشی نەخۆشی تاعوون ببێت کە زۆر بڵاوە لە مەککە.

خاتوو ئامینە تەماشایەکی حەلیمە و جگەرگۆشەکەی کرد. بیری لەو نەخۆشییە کوشندەیە دەکردەوە کە لە مەککەدا بڵاو بووبووەوە. هەر بۆیە هەستی بە دڵتەنگی دەکرد. حەلیمەش لەولاوە چاوەڕێی وەڵامێکی ئومێدبەخشی دەکرد. لە کۆتاییدا ئامینە بەدەم سڕینی فرمێسکەکانیەوە سەری ڕاوەشاند، ئەوەش مانای ئەوەی دەگەیاند"بەڵێ، دەکرێت لەگەڵتا بێت".

ئەو ڕۆژە چەندین جار یەك لە دوای یەك منداڵەکەی ماچ کرد و لە باوەشی گرت. لە کۆتاییدا ڕادەستی دایکە شیرییەکەی کرد. هەروەکو دوو ساڵ لەمەوپێش، دووبارە بە گریانەوە ماڵئاوایی لە جگەرگۆشەکەی کرد. پێغەمبەری خۆشەویستمان دووبارە گەڕایەوە بۆ لای "بەنی سەعد".

***

# ئەو دڵەی بە بەفراو شۆردرایەوە

پێغەمبەری بۆن گوڵین پێنج ساڵان بوو. وەك هەموو جارێکی تر، لەگەڵ عەبدوڵڵای برای شیرییدا مەڕیان دەلەوەڕاند. ماوەیەك بە یارییەوە سەرقاڵبوون، کاتێك ماندوو بوون، لەژێر سێبەری دارخورمایەکدا دانیشتن. عەبدوڵڵا خۆی پێنەگیرا و خەوی لێکەوت. دوای ئەوەی کە بەخەبەرهات، تەماشایەکی چواردەوری کرد و بەدوای برا شیرییەکەیدا گەڕا. کاتێك بینی وا لە لەوەڕگاکەی ئەولاترەوە دوو پیاو موحەممەدی برایان پاڵخستووە، زۆر ترسا. بەهاوارکردنەوە بەرەو ماڵەوە گەڕایەوە، هەم ڕایدەکرد و، هەم دەشگریا.

حەلیمە بە ترسەوە لە ماڵ هاتە دەرەوە. کوڕەکەی دەیویست شتێك بڵێت، بەڵام دەمی تەتەڵەی دەکرد. بە دەستێکی ئاماژەی بۆ شوێنی مەڕەکان دەکرد.

تەنها توانی ئەوەندە بڵێت:

- سنگی موحەممەدیان شەق کرد.

حەلیمە کە بیستی شتێك بەسەر موحەممەدی گوڵدا ﷺ هاتووە، خەریك بوو ببوورێتەوە. بەبێ وەستان بەرەو ئەوێ ڕایکرد. کاتێك پێغەمبەری خۆشەویستی بینی بە پێوە وەستاوە، کەمێك هاتەوە سەرخۆی. یەکسەر توند گرتی بە باوەشییەوە. لەلایەکەوە زۆر دڵخۆش بوو، لەلایەکیشەوە زۆر خەمی بوو. هیچ شتێکی پێوە دیار نەبوو، تەنها ئەوەندە نەبێت دەموچاوی زەرد هەڵگەڕابوو. لە پاشان حاریثی هاوسەریشی هات بۆلایان، ئەویش گرتییە باوەش و، لێی پرسی:

- چی ڕوویدا؟

پێغەمبەری نازدارﷺ زۆر ماندوو دیار بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەڵامی دانەوە و، فەرمووی:

- دوو پیاوی سپی پۆش هاتن و سنگیان لەتکردم، ئینجا دڵمیان بە بەفراو شۆردەوە.

حاریث دەستی پێغەمبەرمانی گرت و بەرەو ماڵەوە بەڕێکەوتن. منداڵەکان لەگەڵ یەکتردا دووبارە دەستیان کردەوە بە یاریکردن. حاریث هاوسەرەکەی ڕاکێشایە لایەکەوە و، چپاندی بە گوێیدا:

- زۆر لەوە دەترسم شتێك بەسەر ئەم منداڵەدا بێت . باشترین شت ئەوەیە کە بیگێڕینەوە بۆ خێزانەکەی.

حەلیمە نەیدەویست وا زوو ئەم منداڵە نازدارە ڕادەستی خێزانەکەی بکاتەوە. بەڵام بەم ڕووداوەی دوایی زۆر ترسابوو. هەر بۆیە بەناچاری پێغەمبەریان هێنایەوە بۆلای دایکی و، جگەرگۆشەی دایەیان گەڕاندەوە.

* * *

## خەمی دایك

خاتوو ئامینە کە منداڵەکەیی لە لایەن دایکە شیرییەکەیەوە ڕادەست کرابووەوە، زۆر هەستی بە شادمانی دەکرد. ڕۆژگار هات و ڕۆشت، ویستی سەردانی خزمەکانی لە مەدینە-یەثریب- بکات. لەگەڵ "ئوموئەیمەن"دا لە ماوەیەکی کەمدا خۆیان ئامادەکرد. لە بەرەبەیاندا بە دوو وشتر بە بیابانی وشکدا کەوتنەڕێ. پێغەمبەرمان ﷺ کە ئەو کاتە تەمەنی شەش ساڵان بوو، زۆر دڵی بەو گەشتە خۆشبوو. بە بێدەنگی لە ئامێزی دایکی شیرینیدا دانیشتبوو. ئامینە خاتوون هەموو ساڵێك بە مەبەستی سەردانکردنی خزمەکانی ئەو گەشتەی ئەنجام دەدا. هەروەها هاوسەری بەوەفا سەردانی گۆڕی مێردەکەشی دەکرد. لە گەشتەکانی پێشوودا دڵخۆش وکامەران بوو، بەڵام لە گەشتی ئەمساڵیدا کەمێك دڵگران بوو. خەمی دڵی نەدەڕەوییەوە . میوانە ئازیزەکانی مەدینە ڕۆیشتنە ماڵی کوڕی خاڵی پێغەمبەر کە

ناوی"نابیغه"بوو. ئیتر ئەو خەڵکەی چاوەڕوانی هاتنی ئەوانیان دەکرد، هاتن بۆ پێشوازی لێ کردنیان. خاڵی پێغەمبەرمان ﷺ فەرمووی لێکردنە ژوورەوە بۆ ئەوەی کەمێك پشوو بدەن. بەڵام دایە ئامینە ویستی یەکەمجار سەردانی گۆڕی عەبدوڵڵای هاوسەری بکات. دایکە غەمگینەکە لە خوای گەورە دەپاڕایەوە. کاتێکیش لە منداڵە نوورانییەکەی دەڕوانی، دڵی ئارام دەبووەوە. موحەممەدیش دەستە پیرۆزەکانی کە هێشتا زۆر بچووك بوون، بەرزکردبووەوە و دەپاڕایەوە بۆ باوکی خۆشەویستی کۆچکردووی. بە نیگاکانی دەیویست بە دایە بڵێ:

- دایەگیان مەگری!

پاش مانگێك مانەوەیان لە مەدینە، خۆیان ئامادەکرد بۆ گەڕانەوە. لەکاتی گەڕانەوەدا ئامینە خاتوون نەخۆش کەوت و لەنزیك گوندی"ئەبوا" وچانێکیان بە گەشتەکەیان دا. ئامینە خاتوون ئەوەندە نەخۆش کەوتبوو، نەیدەتوانی بەردەوام بێت لە ڕۆیشتن. زۆر دڵگران بوو بەوەی کە کوڕەکەی بە تەنها جێبهێڵێت. بۆیە کوڕە نازدارەکەی هێنایە بەردەم خۆی و، بۆ دواجار لەگەڵی دوا:

- خوای گەورە سەربەرز و تەمەن درێژت بکات. ئەگەر ئەوەی لە خەونەکەمدا بینیومە ڕاست بێت، ئەوا تۆ لە لایەن خوای گەورەوە وەك پێغەمبەر نێردراوی بۆ مرۆڤایەتی، تاکو ڕێگای چاك و خراپیان پیشان بدەیت. خوای گەورە لە بتپەرستی دەتپارێزێت. من دەمرم، بەڵام بۆ هەتاهەتایە ناوم یاد دەکرێتەوە.

دوای ئەم وتە پڕ واتایانەی، ڕۆحی سپاردە پەروەردگاری. لە دوای کۆچی دایکی، خوای گەورە، پێغەمبەرە خۆشەویستەکەمانی بە تەنها بەجێنەهێشت. سەرەتا عەبدولمەتەلیب، پاشانیش ئەبوتالیب، ئەرکی بەخێوکردنیان گرتە ئەستۆ.

*** 

# جیابوونەوەکان

عەبدولموتەڵیب کوڕەزا بێ دایك و باوکەکەیی بردە لای خۆی. ئەو خۆشەویستییەی کە بۆ هیچ کام لە کوڕەکانی دەرینەبڕیبوو، بۆ ئەوی دەردەبڕی. موحەممەدی گوڵ هەرگیز لە باپیری جیانەدەبووەوە. تەنانەت لەکاتی نوستنی باپیرەشیدا، بە سەربەستی دەڕۆیشتە لای و دەهاتە دەرەوە. لەسەر ڕاخەرەکەی بەردەم کەعبەدا کە هیچ کام لە کوڕەکانی نەیاندەتوانی دابنیشن، موحەممەد دەهات و دادەنیشت. جارێکیان پیاوێکی نەناسراو لەسەر ڕاخەرەکە لایبرد، ئەمیش دەستی کرد بە گریان. باپیری لە جێی خۆی هەستایەوە و تەماشای ئەو شوێنەی کرد کە دەنگەکەی لێوە دەهات. لەوانەی دەوروبەری پرسی:

- بۆچی کوڕەکەم دەگری؟

ئەوانیش وەڵامیاندایەوە و وتیان کە لەسەر ڕاخەرەکە لایانبردووە.

لە بەرامبەر ئەمەدا عەبدولموتەڵیب وتی:

- وازی لێبهێنن با دانیشێت، ئەو دەبێتە خاوەنی پلەیەك كە كەس پێی ناگات.

لەلای باپیری هەستی بەبێ باوك و دایكی نەدەكرد. كاتێك عەبدولمەتەڵیب تەمەنی بوو بە هەشتا و دوو ساڵ، نەخۆشكەوت و كەوتە سەرجێگا. كە زانی كۆچی دوایی دەكات، دەستبەجێ كوڕەكانی بانگكرد. وەسیەتی كرد كە زۆر ئاگاداری كوڕەزا شیرینەكەی بن. "زوبێر"و "ئەبوتاڵیب" تیروپشكیان كرد بۆ ئەوەی موحەممەد ببەنە لای خۆیان، لە ئەنجامدا "ئەبوتاڵیب" دەرچوو. بەم شێوەیە موحەممەد لە نازی باپیریشی بێبەش بوو. ئەبوتاڵیبی مامی ئەركی بەخێوكردنی لەئەستۆ گرت. ئەبوتاڵیب جگە لە چەند وشترێك كە سوودی لە شیرەكانیان وەردەگرت، خاوەنی هیچ سەروەتێكی تر نەبوو. ئەمە جگە لەوەی خاوەن خێزانێكی قەرەباڵغیش بوو و ڕەنجی زۆری دەكێشا بۆ بەخێوكردنیان. بۆ ئەوەی لەو ماندووبوونە ڕزگاری ببێت، ئەبوتاڵیب بڕیاریدا هاوڕێیەتی ئەو كاروانە بكات كە بە نیاز بوو بڕوات بۆ شام. موحەممەدی گوڵیش ئارەزووی ئەو گەشتە بازرگانییەی دەكرد. بیری دەكردەوە لەوەی كە تۆ بڵێیت ئەویش بەرن لەگەڵ خۆیان؟

وشترەكان ئامادەكران، گەشتەكە خەریک بوو دەستی پێدەكرد. هەموو منداڵەكانی ئەبوتاڵیب وەستابوون بۆ ماڵئاوایی كردن لە باوكیان. لەم كاتەدا ئەبوتاڵیب لە برازاكەی نزیك بووەوە كە بەدەم گریانەوە وەستابوو، لە بەرامبەر گریانەكەیدا وتی:

- دەتەوێت بێیت لەگەڵم؟

موحەممەد زۆر پێی خۆش بوو بڕوات، بەڵام مامەکانی تری لە ترسی ئەوەی نەکا لەو گەشتە دوورودرێژەدا نەخۆش بکەوێت، پێیان باش نەبوو بڕوات. بۆیە پێغەمبەری خۆشەویستمان دەستی کرد بە گریان. ئەبوتاڵیب بەرگەی گریانەکەی نەگرت و، پرسی:

- ئایا لەبەر ئەوە دەگریت کە جێتدەهێڵم؟

پێغەمبەرمان بە چاوی پڕ لەگریانەوە ڕەشمەی وشترەکەی گرت و، وتی:

- مامە تۆ من لای کێ بەجێدەهێڵیت، نە باوکم هەیە نە دایك!

مامی بەرگەی ئەو وشە سەختانەی نەگرت کە موحەممەد لەناخی دڵیەوە دەریدەبڕین. بۆیە وتی سوێند بەخوا ئەبێت لەگەڵ خۆم بتبەم و هیچ کاتێك لەخۆمت جیانەکەمەوە. گوڵە نازدارەکەی هەڵگرت و لەگەڵ کاروانەکەدا کەوتنەڕێ. بەجۆرە پێغەمبەری ئازیزمان لە تەمەنی دوانزە ساڵیدا لەگەڵ مامیدا یەکەم گەشتی بازرگانی ئەنجامدا.

***

# له ڕێگای "شام"دا

له پەنجەرە کراوەکەی پەرستگاکەوە ڕەشەبایەکی گەرم چووە ژوورەوە. ئەو کەسەی لەسەر کورسیە بچووکەکەی ژوورەوە دانیشتبوو و سەرقاڵی کتێب خوێندنەوە بوو، "بەحیرا"ی ڕاهیب بوو. هەستی بە تینوویەتییەکی زۆر کرد، بۆیە هەستا تا کەمێك ئاو بخواتەوە. لە پەنجەرەکە نزیك بووەوە و سەیرێکی بیابانەکەی کرد. لەو بیابانە فراوانەدا جگە لە چەند دار خورمایەك، هیچی تری لێنەبوو. شوانێك لە بیرەکە ئاوی دەردەهێنا بۆ مەڕەکانی. ڕاهیبەکە زیاتر ورد بووەوە، لە دوورەوە لەناو تەپۆڵکە لمینەکانەوە کاروانێکی بەدیکرد. ماوەیەك تەماشای کاروانەکەی کرد، دواتر ڕۆیشتە دەرەوە بۆ سەر بیرەکە. ڕاهیبەکانی تر بە ڕاکردن هاتن بۆ لای و ئاویان لە بیرەکە دەرهێنا و دایان بە بەحیرا. پاشان گەڕایەوە ژوورەکەی. بەحیرا قاچی لەسەر یەکەمین پلەی پلیکانە بەردینەکە دانا، بەڵام هێشتا خەیاڵی لای کاروانەکە بوو کە تا دەهات زیاتر بەدیار دەکەوت. تا وای لێهات کاروانچیەکان دەبینران. بەڵام ئەم جارە جیاواز لە جارەکانی پێشوو، یەکسەر نەڕۆیشتە ژوورەوە، بەڵکو پاڵی بەدیوارەکەوە دایەوە و ماوەیەکی زۆر تەماشای کاروانەکەی کرد. لەگەڵ نزیکبوونەوەی کاروانەکە، جۆش و خرۆشی بەحیرای ڕاهیبیش زیادی دەکرد. وەك بڵێی

درەختەکانی دەوروبەر سڵاو لە کاروانەکە بکەن، ئاوەها دەنوشتانەوە. کاروانەکە لەژێر دارخورماکاندا پشوویاندا. بەحیرا بە تەواوی سەری سووڕمابوو. بۆیە خێرا یاریدەدەرەکەی بانگکرد و بە دەستی ئاماژەی بۆ کاروانەکە کرد و، وتی:

- داخۆ ئەو کاروانە لە کوێوە هاتووە؟

یاریدەدەرەکە تەماشایەکی ڕاهیبەکەی کرد، ئەوجا لە کاروانەکە ورد بووەوە و، وتی:

- نازانم، لەوانەیە لە مەککەوە هاتبێتن!

بەحیرا کەوتبووە بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە:

- سەیرە، پەڵەهەورێك بەسەر کاروانەکەوەیە و لەگەڵیاندا دەجووڵێت!.

ئەمەی وت و لەپڕ ڕاچڵەکی:

- ئەی ئەگەر...

بە پەلە گەڕایەوە ژوورەکەی. یاریدەدەرەکەی هیچ تێنەدەگەیشت. بەمەراقەوە تەماشایەکی ڕاهیبەکەی کرد، پاشان ئاوڕی دایەوە بۆ لای کاروانەکە. لە دوورەوە و لە نێوان تراویلکەکاندا کاروانەکە پشوویان دەدا. کەمێك ورد بووەوە لێیان، شتێکی بینی کە تا ئەو کاتە نەیبینیبوو. هەر بە ڕاستی پەڵەهەورێك بەسەر کاروانەکەوە بوو. کاتێك ویستی بگەڕێتەوە سەرکارەکەی خۆی، بەحیرا لە پەنجەرەکەوە سەری کێشا و، وتی:

- ئەوە تۆ لە کوێی؟

یاریدەدەرەکەی بە ڕاکردن بەرەو لای بەحیرا چوو تا بزانێت چی دەوێت. بەحیرا وتی:

- ئەو کاروانە دەبینی؟ بڕۆ بۆ لایان و بانگهێشتیان بکە بۆ نانخواردن.

یاریدەدەرەکە بە پلیکانەکاندا ڕۆشتە خوارەوە و بەرەو لای کاروانەکە بەڕێکەوت. ڕاهیبەکەش چێشتلێنەرەکەی دۆزییەوە و، پێیوت کە خواردن ئامادە بکات. دوای ئامادەکردنی هەموو شتێك، خۆشی کەوتە چاوەڕوانی. یاریدەدەرەکە کاروانەکەی بانگهێشت کردبوو و ئەوانیش میواندارییەکەیان پەسەند کردبوو. پاش ماوەیەك، ئەندامانی کاروانەکە، یەك یەك و دوو دوو دەهاتن، تا ئەوەی هەموویان لەسەر خوانەکە کۆبوونەوە. بەحیرا وازی لە خواردن هێنابوو و بەناو خەڵکەکەدا هاتووچۆی دەکرد، دیار بوو کە بەدوای یەکێکدا دەگەڕا، بەڵام ئەوەی ئەم بۆی دەگەڕا، لەناو ئەوانەدا نەبوو. هەر بۆیە ڕووی کردە ئەبوتاڵیب و، پرسی:

- دڵنیایت کە هەموو کاروانچیەکان هاتوون بۆ خواردن؟

ئەبوتاڵیب وەڵامی دایەوە و، وتی:

- جگە لە منداڵێك هەمووی هاتووە.

بەحیرا پرسی:

- بۆچی ئەو منداڵە نەهاتووە؟

ئەبوتالّیب :

- بۆ چاودێری کردنی کاروانەکە بەجێمان هێشتووە.

بەحیرا:

- ئەویش بانگ بکەن با نانەکەی بخوات.

بەحیرا لە لایەك خەریکی خزمەتکردنی میوانەکان بوو، لەلایەکی تریش خەیاڵی هەر لای منداڵەکە بوو. زوو زوو تەماشای ڕێگاکەی دەکرد و دواتر دەگەڕایەوە لای میوانەکان. چاوەڕوانییەکەی ڕاهیب زۆری نەخایاند و لە کۆتاییدا بەجێماوی کاروان گەیشت. هەر کە چاوی کەوت بە ڕوخساری گوڵئاسای حەزرەتی موحەممەد، لە تاو سەرسامی ئاگای لە خۆی نەما، چونکە ئەمە ئەو کەسە بوو کە ئەم چەندین ساڵە بە دوایدا وێڵە. سەرەڕای ئەمانە دەبوایە چەند لێکۆڵینەوەیەکی بکردایە. بۆیە لەپاش نانخواردن، ئەبوتالّیبی بردە پەنایەکەوە و، لێی پرسی:

- ئەو منداڵە کێیە؟

ئەبوتالّیب:

- کوڕمە.

بەحیرا باوەڕی بە وەڵامەکەی نەکرد، بۆیە بەردەوام بوو:

- ئەو کوڕە نابێت منداڵی تۆ بێت!

بۆیە ئەمجارە ئەبوتالّیب ڕاستییەکەی وت:

- بەڵێ ڕاستەکەی، برازامە. بەڵام من سەرپەرشتی دەکەم.

بەحیرا:

- باوکی کێیە؟

- عەبدوڵڵا

- ئایا باوکی لە ژیاندا ماوە؟

- نەخێر، پێش ئەوەی ئەم لەدایك بێت، کۆچی دوایی کرد.

بەحیرا زانی کە ئەوە ڕاستییەکەیەتی. لەو منداڵەدا هەموو ئەو ناوپیشانە هەبوون کە ئەم بە دوایدا دەگەڕا. بەڵام پێویست بوو لە نزیکەوە لێکۆڵینەوەی تری لەسەر بکات. بۆیە منداڵەکەی بانگ کردە سوچێکەوە و دەستی کرد بەگفتوگۆکردن لەگەڵی. سوێندی دا بە "لات و عوززا" کە ڕاست وەڵامی بداتەوە. کاتێك سەروەرمان ناوی لات و عوززای بیست، یەکسەر دەموچاوی گرژ بوو و، وتی:

- من بە بتەکان سوێند مەدە، ئەوەندەی ڕقم لەو بتانەیە، ڕقم لە هیچ شتێکی تر نییە.

بەحیرا هێدی هێدی لە ئامانجەکەی نزیك دەبووەوە، بۆیە ئەمجارەیان وتی:

- باشە سوێندم بۆ بخۆ بە خوای گەورە کە بەڕاستی وەڵامم بدەیتەوە.

سەروەرمان کە ئەمەی بیست، فەرمووی:

- بپرسە، هەموو پرسیارەکانت بە ڕاستی وەڵام دەدەمەوە.

کاتێك سەروەرمان قسەی کرد، پیرە ڕاهیب دەستبەجێ زانی کە ئەوە کۆتا پێغەمبەری چاوەڕوانکراوە. بەڵام تامەزرۆی ئەوە بوو مۆری پێغەمبەرایەتییەکەشی ببینێ. لە کۆتاییدا مۆرەکەی سەرپشتیشی بینی. هەروەکو لە کتێبەکاندا هاتبوو، مۆری پێغەمبەرایەتی کە هێندەی هێلکە کۆترێك دەبوو، لەسەر شانی حەزرەتی موحەممەد بوو. بەحیرای ڕاهیب ئیتر هیچ گومانێکی نەما. بۆیە ئەبوتالیبی بانگکردە لایەك و، پێی وت:

- برازاکەت ببەرەوە بۆ شوێنی خۆی. ئەو دواهەمین پێغەمبەری چاوەڕوانکراوە. ئەگەر یەهودییە ڕق لەدڵەکان بیبینن، لەوانەیە زیانی پێبگەیەنن. بەمجۆرە ئاگاداری کردەوە. ئەبوتالیبیش لە پێناو ئەوەی هیچ زیانێك بەبرازاکەی نەگات، هەر لەوێ هەموو کەرەستەکانی فرۆشت و گەڕایەوە بۆ مەککە.

***

# هاوسەرگیری

"ئەوە گەڕایەوە... کاروانەکە گەڕایەوە!" ئەوگەنجەی بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد: "کاروانەکە گەڕایەوە" بەم هات و هاوارەی هەواڵەکەی بەناو هەموو مەککەدا بڵاوکردەوە.

لەناکاو لە شەقامەکاندا دەنگەدەنگێکی زۆر بڵاوبووەوە. لە کۆتاییدا ئەو کاروانەی چەندین ڕۆژ لەمەوبەر ڕۆشتبوو بۆ شام، گەڕایەوە.

حەزرەتی خەدیجە لەگەڵ دراوسێکانیدا لەماڵەوە قسەی دەکرد. یەکێك لە ژنەکان بە پەنجە ئاماژەی بۆ ئەو پەڵە هەورە کرد کە بەسەر کاروانەکەوە بوو. لە ڕاستیشدا پەڵەهەورێك سێبەری بۆ کاروانەکە کردبوو. بەڵێ، جیاوازییەك هەبوو لەکاروانەکەدا.

پاشان حەزرەتی خەدیجە ڕۆشت بۆ لای "وەرەقە"ی ئامۆزای. وەرەقە کەسێکی زانابوو. خەدیجە هەموو ئەو شتانەی کە بینیبووی و بیستبووی دەربارەی "موحەممەدولئەمین" بۆ ئامۆزاکەی گێڕایەوە. وەرەقە سەرسامی خۆی دەربڕی و، وتی:

- ئەگەر ئەوانەی تۆ دەیڵێیت ڕاستبن، ئەوا بێگومان موحەممەد پێغەمبەرە. من دەمزانی لەم ئوممەتەدا پێغەمبەرێك دەردەکەوێت. ئەو سەردەمەش کە ئەو پێغەمبەرەی تیادا دەردەکەوێت، ڕێك ئەم سەردەمەیە.

حەزرەتی خەدیجە، پێغەمبەری خوای لە منداڵییەوە دەناسی. لە کاروانەگەشتی ئەمجارەشدا، داوای لێکردبوو کە ببێت بە سەرپەرشتیاری کاروانە بازرگانییەکەی، ئیدی بەمجۆرە لە نزیکەوە حەزرەتی موحەممەدی ناسی. حەزرەتی خەدیجە کە ئافرەتێکی بێوەژن بوو، بڕیاریدا لەگەڵ پێغەمەری سەروەرمان هاوسەرگیری بکات. هەر بۆ ئەم مەبەستە "نەفیسە"ی هاوەڵی وەك هەواڵدەرێك ناردە لای ئازیزمان. نەفیسە داواکارییەکەی گەیاندە پێغەمبەر ﷺ.

- ئەی موحەممەد، چی هەیە ببێتە ڕێگر لەبەردەم هاوسەرگیریتدا؟

پێغەمبەر ئازیزمان ﷺ لەلای مامی دەمایەوە و ئەوەندە سەروەت و سامانی نەبوو کە ژن بهێنێت. بۆیە وتی:

- پارەم بەدەستەوە نییە، ئیتر چۆن دەتوانم هاوسەرگیری بکەم!

- ئەی ئەگەر خەرجی هاوسەرگیرییەکەت بۆ پەیدا کرا و کەسێکی هاوشانی خۆشت دۆزییەوە، ئایا ڕازی دەبیت؟

لە بەرامبەر ئەمەدا ئازیزمان پرسی:

- دەربارەی کێ دەدوێیت؟

نەفیسە وتی:

- دەربارەی خەدیجە.

پێغەمبەری ئازیز ﷺ بەرامبەر بەم داواکارییە سەری سووڕما. بۆیە وتی:

- شتی وا چۆن دەبێت!

نەفیسە بزەیەکی کرد و، وتی:

- ئیتر ئەوەیان کاری منە.

- پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی کەواتە تۆ چی بڵێیت منیش وا دەکەم.

نەفیسە بێ ئەوەی کات بە فیڕۆ بدات، ئەم هەواڵە خۆشەی گەیاندە خاتوو خەدیجە. شادمانییەکی زۆر کەوتە ماڵەکەوە. هەموو ئامادەکارییەکان لە ماوەیەکی کەمدا سازکران. میوانەکان وردە وردە دەهاتن بەرەو ماڵی حەزرەتی خەدیجە.

خوانێکی ڕازاوە بۆ میوانەکان ئامادەکرا و خواردنیان پێدرا. لەکۆتایی زەماوەندەکەدا، گەورە پیاوان یەك بەیەك قسەیان کرد. لەکۆتاییشدا وەرەقە هەستایە سەرپێ و، وتی:

- ئەی قوڕەیشییەکان! ئێوە بە شایەت بن کە من "خەدیجەی کچی خوەیلید"م لە "موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا" مارەکرد. ئیتر بەو شێوەیە هەموو کەسێکی لەم هاوسەرگیرییە پیرۆزە ئاگادارکردەوە.

بەمجۆرە پێغەمبەر ﷺ ئەو شەوە حەزرەتی خەدیجەی مارەکرد. لە دوای ئەو ڕۆژەوە، پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ ماڵی ئەبوتاڵیبی مامی بەجێهێشت و لە ماڵی حەزرەتی خەدیجەدا مایەوە.



# بەردە ڕەشەکە

ماڵی خوا (کەعبەی پیرۆز) لە ئەنجامی لافاو و باران بارینەوە خەریك بوو دەڕووخا. بۆیە قوڕەیشیەکان بڕیاریاندا نۆژەنی بکەنەوە. ئەمە کارێکی ئاسان نەبوو، بۆیە ئەوانەی خەریکی کارکردن بوون، زۆر ماندوو دەبوون. یەکێکیان لە ژێر سێبەرەکە هاتە دەرەوە و تەماشایەکی بەرزبوونەوەی دیوارەکەی کرد. تا دەهات کاری نۆژەنکردنەوەکە خێراتر دەبوو و بیناکەش تەواو جێگیر بووبوو. لەکاتێکدا کە هێمنی و ئارامی باڵی کێشابوو بەسەر ئەو ناوەدا، لەناکاو لە پشتەوە دەنگە دەنگێك بەرزبووەوە. یەکێك بە تووڕەییەوە هاواری دەکرد.

کرێکارەکان بەرەو دەنگە دەنگەکە ڕۆیشتن. دوو کەس، کە سەر بە دوو هۆزی جیاواز بوون، شەڕیان دەکرد. "حوزەیفە" کە لە هەموویان بەتەمەنتر بوو، هاتە ناوجەرگەی قەرەباڵغییەکەوە و، وتی:

- چی ڕوویداوە، ئەم شەڕە چییە لێرە؟

"عامر" بەزۆر خۆی ڕاستکردەوە. هەموو گیانی تۆزاوی بووبوو و پۆشاکەکەشی دڕابوو. هەر کە هەستایەوە، ویستی دووبارە پەلاماری برادەرەکەی بداتەوە، بەڵام ئەوانەی چواردەوری نەیانهێشت.

عامر هاواری کرد و، وتی:

-دەیویست بەردە ڕەشەکە بخاتەوە شوێنی خۆی!

جا کاتێك خەڵکەکە ئەمەیان بیست، هەر کەسەو لە شوێنی خۆیەوە دەستی کرد بە قسە کردن.

- نابێت، شتی وا نابێت، ئێمە دەیخەینەوە شوێنی خۆی!

- نەخێر، ئێمە دەیخەینەوە شوێنی خۆی!

ئیتر بەمجۆرە دەمەقاڵەی نێوانیان تا دەهات گەرمتر دەبوو. تا ئەوەی کێشەکە هێندە گەورە بوو، خەریك بوو دەستیان دەچووە خوێنی یەکتری. زۆری نەمابوو بکەونە گیانی یەکتری، کە حوزەیفە هاواریکرد:

-ڕاوەستن! لەگەڵ ئێوەمە، ڕاوەستن!

وا دیار بوو ئاگادارکردنەوەکە جێی خۆی گرتبوو. هەر هۆزەو چووە لایەك و گوێیان بۆ قسەی پیرەمێردەکە ڕاگرتبوو. بەڵام هەموویان تووڕەییان لێدەباری. بە بچووکترین جووڵە، دەستیاندەکردەوە بە شەڕ. هۆکاری ئەم ناکۆکییەش ئەوە بوو کە هەر هۆزەو دەیویست ئەو بەردە ڕەشەی کە لە بەهەشتەوە نێردراوەتە سەر زەوی، خۆی بیخاتەوە شوێنی

خۆی. چونکە بەهۆی ئەوەوە ڕێزی هۆزەکە زیادی دەکرد. "ئەبوئومەییە" ڕۆیشتە ناوەڕاستی هەموویانەوە و، دەستی کرد بە قسە:

- دەزانم هەر هۆزە و دەیەوێت خۆی بەردە ڕەشەکە بخاتەوە شوێنی خۆی. منیش هەرچەندە سەیر دەکەم، ئەم کێشەیە بە ئێمە چارەسەر نابێت.

ئینجا بە دەستی ئاماژەی بۆ شوێنێك کرد و، وتی:

- با یەکەم کەس کە لە دەرگای "شەیبە"وە دێتە ژوورەوە، بیکەین بە ناوبژیوانمان و هەرچییەکی وت بەقسەی بکەین.

هەموویان بیرۆکەکەیان بەلاوە پەسەند بوو. ئیتر دوای ئەمە هەموویان چاویان بڕییە ئەوەی کە ئایا کێ یەکەم کەس لە دەرگاکەوە دێتە ژوورەوە!

هەموان بە دڵەخورپەوە چاویان بڕیبووە دەرگاکە. لە دەرگاکەوە یەکێك هاتە ژوورەوە. بە شێوازی ڕۆیشتنەکەیدا هەموویان ناسیانەوە، بەخۆشییەوە هاواریانکرد:

- ئەوە موحەممەدە!

- وا ئەلئەمین (دەستپاك و ڕاستگۆ) دێت!

عامر بە پەلە لە شوێنی خۆی هەستایەوە و، وتی:

- سوێند بێت هەر بڕیارێك ئەو بیدات، ئێمە پێی ڕازین.

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ متمانەی هەمووانی بەدەست هێنابوو، بە کەسێکی ڕاستگۆ و دروست ناسرابوو. دەیتوانی چارەسەری ئەو ناکۆکی و لێك تێنەگەیشتنە بکات کە کەوتبووە نێوان هۆزەکانەوە. کێشەکەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد. ئینجا چاوەڕوانی ئەوەیان کرد بزانن چۆن بۆیان چارەسەر دەکات. پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ ڕێگەیەکی زۆر جوانی پێشنیازکرد. سەرداری بوونەوەران حەزرەتی موحەممەد ﷺ فەرمووی:

- پارچە قوماشێکم بۆ بهێنن.

گەورە و بچووك سەریان سووڕمابوو لەوەی ئەم پارچە قوماشەی بۆچییە؟ ئەوجا پێغەمبەرمان ﷺ پارچە قوماشەکەی ڕاخست و بەردە ڕەشەکەی لە ناوەڕاستیدا دانا و، فەرمووی:

- لەهەر هۆزە و یەکێك چمکێکی بگرێت.

بەم شێوەیە بەردەکەیان بردە نزیك شوێنی خۆی و پێغەمبەرمان ﷺ بەدەستی موبارەکی بەردەکەی هەڵگرت و خستییەوە شوێنی خۆی. ئەوانیش دەستیانکردەوە بە دروستکردنەوەی دیوارەکە. بەمجۆرە پێغەمبەر ﷺ هەم بوو بە هۆکاری ئەوەی بیناکە تەواو بکرێت، هەم بەشێوەیەکی ئاسان توانی چارەسەری کێشەی هۆزەکان بکات و نەهێڵێت جەنگ لە نێوانیاندا هەڵبگیرسێت.

* * *

# تەنهایی

چەند ساڵێکی زۆر تێپەڕی بەسەر هاوسەرگیرییەکاندا لەگەڵ حەزرەتی خەدیجەدا. تەمەنی پێغەمبەرمان ﷺ بووبوو بە سی و هەشت ساڵ. لەو ماوەیەدا بەزۆری لە خەڵك دووردەکەوتەوە و بە تەنهایی بە دۆڵەکاندا دەگەڕا. ڕۆژێکیان لە کاتی گەڕاندا دەنگێکی بیست:

- سەلامت لێبێت ئەی پێغەمبەری خوا!

پێغەمبەرمان ﷺ یەکسەر ئاوڕی دایەوە بۆ دواوە، بەڵام کەسی نەبینی. جگە لە درەختێك کە خەریك بوو وشك دەبوو، هیچ شتێکی تری لێنەبوو. زۆر دوور نەکەوتبووەوە کە تاشە بەردێکیش لە پاڵیدا سەلامی لێکرد. زۆر ڕووداوی وەك ئەمانە و هاوشێوەیان ڕوویاندا. ئەو دەنگانەی کە دەیبیستن و ئەو نوورانەی دوای درەوشانەوەیان بزر

دەبوون، نەیدەزانی مانایان چییە. ئەم دۆخەی پێغەمبەرﷺ سالێکی خایاند. کاتێك تەمەنی بوو بە سی و نۆ سال، خەونی ڕاستی دەبینی. ئەو شتانەی کە بە ڕۆژ ڕوویان دەدا، لە شەودا لەنێوان خەون و بێداریدا پیشانی دەدرا. ئەو خەونانەی بە شەو دەیبینین، کاتێك ڕۆژ دەبووەوە، یەکە بە یەکەیان دەهاتنە دی. ئەم ڕووداوانە توشی سەرسامییان کردبوو، وایان لێکردبوو کە زۆر لە بیرکردنەوەدا ڕۆبچێت. خوای بالادەست ئەوی بۆ ئەو پێغەمبەرایەتییە ئامادە دەکرد کە بەو نزیکانە پێی ڕادەسپارد. بەهۆی ڕاستیی خەونەکانییەوە، پێغەمبەرمان ﷺ تەنهایی هەڵدەبژارد و لە مرۆڤەکان دووردەکەوتەوە. دەچووە شوێنی ئارام و چەندین کاتژمێر بیری دەکردەوە.

***



# ئەشکەوتی حیرا

لەو کاتەدا کە ئەستێرەکانی بەرەبەیان دەدرەوشانەوە، دوو کەس بە هێواشی بە ناو بیابانەکەدا هەنگاویان دەنا. هەوا فێنك بوو. هێشتا

ڕۆژ هەڵنەهاتبوو، بەڵام ڕووناکیەکی جیاواز ئەو ناوەی داپۆشیبوو. لەو بیابانە فراوانەدا تەنها دوو جێ پێ دیار بوو. ڕەشەباش جێ پێکانی ون دەکرد. "حەسەن" کە بوخچەی خواردنەکەی بەدەستەوەبوو، لە هاوەڵەکەی نزیک بووەوە و، وتی:

- زۆرمان ماوە؟

"سابت" کە کوڕێکی باڵابەرز بوو، ئاوڕی دایەوە بۆ دواوە و بە بێدەنگی سەیری چواردەوری خۆی کرد، پاشان چاوی بڕییە شاخەکە و، وتی:

- تا نەیدۆزینەوە ناگەڕێینەوە.

حەسەن نزیك بووەوە لە هاوەڵەکەی و بە دەستی ئاماژەی بۆ شوێنێك کرد:

- تۆ بڵێی لە ئەشکەوتەکەدا بێت؟

سابت سەری لەقاند و ئەرێی بۆ کرد:

- ئەگەرێکی زۆر هەیە لەوێ بێت.

ڕەشەبایەکی بەهێز هەڵی کرد و گێژەڵوکەیەکی لماویش هەردووکیانی لەناو تۆزدا ونکرد. چاویان هیچی نەدەبینی. وا دیار بوو حەسەن تۆزێك ترسابوو، بۆیە ڕووی کردە سابت و، وتی:

- بگەڕێینەوە باشتر نییە؟ هەم زۆریش ماندوو بووین. دواتر خواردنەکەی بۆ دەبەین؟

کاتێك گێژەڵووکە لمیینەکە ڕەوییەوە، بەخێرایی کەوتنەڕێ. سابت دەستی هاوڕێکەی گرت و ڕایکێشا.

- بەڵێنمان بە خەدیجە داوە. کاری ئێمە ئەوەیە خواردنەکەی بۆ ببەین.

ئەمەی وت و دەستیان کرد بە سەرکەوتن بەسەر شاخەکەدا کە تەنانەت درەختێکی وشکیشی تێدا نەبوو. ڕەشەبای بیابانەکە وەستابوو. دەوروبەر زۆر هێمن بوو. لە کاتێکدا کە بەسەر شاخەکەدا سەردەکەوتن، مانگ بەپڕی بەسەر بیابانەکەوە دەرکەوت. ئێستا دەوروبەر زۆر جوانتر دەبینرا. دوو گەنجەکە بەردەوام بوون لە قسەکانیان. سابت وتی:

- هەفتەیەکە لە مەککە نەمبینیوە.

- زۆر ڕاستە، لە مرۆڤەکان دوور دەکەوێتەوە.

- تۆ بڵێی هۆکارەکەی چی بێت؟

- قابیلە چی بێت؟ دادگەری نەماوە لە نێوان مرۆڤەکاندا. بەهێزەکان لاوازەکان دەچەوسێننەوە. لە بازرگانیدا هەرکەسەو ئەویتر دەخەڵەتێنێت. جا ئایا لە بەرامبەر ئەم هەموو خراپەکارییانەدا خۆت پێدەگیرێت دڵتەنگ نەبیت؟

حەسەن لەناکاو وەستا. پاشان تەماشای ڕوخساری هاوەڵەکەی کرد و، وتی:

- بەڵام خۆ هەموو کەسێك یەکێکی هەر هەیە متمانەی پێبکات!

سابت به جۆرێك ڕوانییه حەسەن، وەك ئەوەی بڵێت مەبەستت کێیه. حەسەن به دەنگێکی شیرین وتی:

- موحەممەدی دەستپاك و ڕاستگۆ

به دەستیش ئاماژەی بۆ ئەشکەوتەکە کرد.

- ڕاست دەکەیت، هەرچۆنێك بێت ئەوەندەمان نەماوە بۆ ئەشکەوتەکە. ئەمانەتەکەی ڕادەست دەکەین و دەگەڕێینەوە.

ئەمەی وت و بەردەوام بوون له سەرکەوتن به چیاکەدا. دوو گەنجەکە پاش ئەوەی نانەکەیان دا به پێغەمبەر ﷺ، به جێیان هێشت. پێغەمبەرمان ﷺ تا ئەو کاتەی توێشووەکەی تەواو دەبوو، لەوێ دەمایەوە و سەرگەرمی پاڕانەوە دەبوو له خوای گەورە. ئەمجارەیان کاتێك خواردنەکەی تەواو بوو، له ئەشکەوتەکە هاتە دەرەوە. پلەی گەرما بەرزبوو، ئەو بیابانە پان و بەرینە له گەرمادا دەکولا.

پێغەمبەرمان ﷺ ئەو کاتەی گەیشتە کۆڵانەکانی مەککە ئینجا خەڵکی بینی. دەستبەجێ خۆی گەیاندە کەعبە. هەندێك لەو خەڵکانەی لەوێ بوون، بتیان دەپەرست و هەندێکی تریان له نێوان خۆیاندا قسەیان دەکرد و کەسانێکیش پاڵیاندابوو به دیواری کەعبەوە و نوستبوون. پێغەمبەرمان ﷺ به ناویاندا تێپەڕی و تەوافی کەعبەی کرد. دواتر گەڕایەوە ماڵەوە.

حەزرەتی خەدیجە لەبەردەم دەرگاکەدا پێشوازی لێکرد و فەرمووی لێکردە ژوورەوە. به گەڕانەوەکەی زۆر دڵخۆش بوو. ماوەیەکی زۆر بوو

پێغەمبەرمان ﷺ بە شێوەیەکی چڕ ڕۆدەچووە ناو بیرکردنەوەوە حەزرەتی خەدیجەش-خوای لێ ڕازی بێت- ئەوەندەی لە توانایدا بوایە هاوکاری هاوسەرەکەی دەکرد، نان و ئاوی بۆ دەنارد. ئەگەر بۆ چەند شەوێکیش نەهاتایەتەوە ماڵەوە، ئەکەوتە مەراقەوە و یەکێکی دەنارد بۆ بیابانەکە تاکو هەواڵی بزانێت. پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ هەموو ئەو شتە نائاساییانەی بۆ حەزرەتی خەدیجە گێڕایەوە کە بەسەری هاتبوون. کاتێك بە تەنها دەمایەوە، ڕووناکی دەبینی و گوێی لە کۆمەڵە دەنگێك دەبوو، دەترسا لەوەی ئەوانە پەیوەندیان بە جنۆکە و جادووگەرەکانەوە هەبێت. بۆیە بە حەزرەتی خەدیجەی فەرموو:

- دەترسم لەوەی ئەو شتانەی بەسەرمدا دێن، هەر ئەو شتانە بێت کە بەسەر کاهینەکاندا دێت. وەڵاهی ئەوەندەی ڕقم لەو بت و کاهینانەیە، ڕقم لە هیچ شتێکی تر نییە.

حەزرەتی خەدیجەش بە شێوازە ناوازەکەی خۆی دڵنەوایی هاوسەرە ئازیزەکەی کرد و، وتی:

- هەرگیز خوای گەورە کەسێکی وەك تۆ بەهەدەر نادات. چونکە تۆ کەسێکی ئەمانەت دەپارێزیت و چاکە لەگەڵ خزمانتدا دەکەیت و لە قسەکانتدا ڕاستگۆیت.

پێغەمبەرمان ﷺ پاش چەند ڕۆژێك دیسانەوە ڕۆیشتەوە بۆ ئەشکەوتەکە. دووبارە شەوێکی ساماڵ بوو. دەوروبەر کش و مات بوو. ئەو شەوە ئەستێرەکانی ئاسمان لە هەموو شەوەکانی تر درەوشاوەتر

بوون، هێندە نزیك بوون دەتوت زۆری نەماوە بکەونە خوارەوە. لە درەنگانێکی شەودا پێغەمبەرمان ﷺ خەوی لێکەوت.

لە دەمی نزیك بوونەوەی بەرەبەیاندا، شنەی شەماڵێکی ناسك هەڵی کرد. لەگەڵ شنەی شەماڵەکەدا، ناو ئەشکەوتەکە پڕبوو لە بۆنی خۆش. ئاسۆ وردە وردە سوور دەبوو و ئاماژەی ئەوەی دەدا کە زۆری نەماوە خۆر هەڵبێت. ئەشکەوتە تاریکەکە لەناکاو پڕبوو لە نوور. جوبرەئیل- سەلامی خوای لەسەر بێت- لە شێوەی مرۆڤێکی جواندا هاتبووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆ ناو ئەشکەوتەکە. هاودەم لەگەڵ ڕووناکییەکی بێوێنەدا کە چاوی مرۆڤی دەبرد، خۆی پیشانی سەروەرمان دا.

لەناو ئەو بۆن و بەرامە خۆشەدا، حەزرەتی جوبرەئیل -سەلامی خوای لەسەر بێت- ڕووی کردە پێغەمبەر ﷺ و بە دەنگێکی زوڵاڵ پێی وت:

- بخوێنە.

ئازیزمان ﷺ لە بەرامبەر ئەمەدا فەرمووی:

- من خوێندەوار نیم.

ئەمجارەیان حەزرەتی جوبرەئیل -سەلامی خوای لەسەر بێت- پێغەمبەری نازداری توند گوشی بە خۆیەوە و، دووبارە پێی وتەوە:

- بخوێنه.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

- من خوێندەوار نیم، پێم بڵێ چی بخوێنم؟

جوبرەئیل -سەلامی خوای لەسەر بێت- بۆ جاری سێهەم پێغەمبەری توند گوشی بە خۆیەوە و، فەرمووی:

﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ۝١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ۝٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ۝٣ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ۝٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ﴾ (العلق: ١-٥)

**" بخوێنە! بەناوی ئەو پەروەردگارەوە بخوێنە کە هەموو شتێکی دروستکردووە! ئەو، ئادەمیزادی لە چەند خانەیەکی هەڵواسراو دروستکردووە. بخوێنە، لەکاتێکدا هەر پەروەردگاری تۆ بەخشندەیە. ئەو بەهۆی پێنووسەوە نوسین و خوێندنەوەی فێرکردووە و، ئەوەی فێری ئادەمیزاد کردووە کە پێشتر نەیزانیووە."**

پێغەمبەرمان ﷺ وشە بە وشەی ئایەتەکەی دووبارە کردەوە. ئەو ئایەتانەی کە دابەزین، لەسەر زمان و دڵی پێغەمبەری خودا چەسپین. جوبرەئیل-سەلامی خوای لەسەر بێت- لەگەڵ تەواوکردنی ئەرکەکەیدا، لەبەرچاودا ونبوو و دیار نەما.

پێغەمبەرمان ﷺ بە ترس و پەشۆکانەوە لە ئەشکەوتەکە هاتە دەرەوە و خێرا بەرەو مەککە گەڕایەوە.

بەڵێ، خوای گەورە ئەرکی پێغەمبەرایەتی پێ سپاردبوو. بەدڵەخورپێوە هاتەوە ماڵەوە.

حەزرەتی خەدیجە —خوای لێ ڕازی بێت- بە پەرۆشییەکی زۆرەوە چاوەڕێی هاتنەوەی دەکرد. هەر کە خۆشەویستمان گەیشتە ماڵەوە، دەستبەجێ ڕۆیشتە ناو جێگاکەی و، فەرمووی:

- ئەی خەدیجە دامپۆشە..

لەگەڵ ئەوەشدا کە خاتوو خەدیجە هەستی بەو گۆڕانە کرد کە بە ڕوخساری پێغەمبەرەوە دیار بوو، کەچی هیچی لێ نەپرسی. چاوەڕێی کرد تاکو ترس و لەرزەکەی بڕەوێتەوە.

پاش کەمێك پێغەمبەر ﷺ لەخەو بێدار بووەوە. هەموو ڕووداوەکانی بۆ خێزانە خۆشەویستەکەی گێڕایەوە و، فەرمووی:

- خەدیجە دەترسم! دەترسم لەوەی شتێکم بەسەردا بێت.

حەزرەتی خەدیجە زۆر بە ئارامی گوێی بۆ پێغەمبەری خوا ڕاگرتبوو. دڵنەوایی کرد و لە کۆتایی قسەکانیشیدا فەرمووی:

- خۆڕاگر بە! وەڵڵاهی ئومێد دەکەم کە ببیت بە پێغەمبەری ئەم نەتەوەیە.

***

# حەزرەتی عەلی

جوبرەئیل -سەلامی خوای لێبێت- پێغەمبەرمانی فێری دەستنوێژ و نوێژکردن کردبوو. پێغەمبەری خواش ﷺ ئەمانەی فێری یەکەمین موسوڵمان کرد کە هاوسەرە خۆشەویستەکەی بوو. هەردووکیان پێکەوە لە ماڵەوە نوێژیان دەکرد. حەزرەتی عەلی کە هێشتا منداڵ بوو، هاتە ماڵیان و ئەوانی بەو جۆرە بینی. بە سەرسامییەوە تەماشای دەکردن، هەر کە نوێژەکەیان تەواوکرد لێی پرسین:

ـ ئەوە چی بوو دەتانکرد؟

پێغەمبەر ﷺ سەری عەلی خستە سەر سنگی موبارەکی و، بە زەردەخەنەیەکەوە فەرمووی:

- نوێژمان دەکرد.

حەزرەتی عەلی یەکەمجار بوو ئەو وشەیە ببیستێت، بۆیە پرسی:

- باشە، ئەی نوێژ چییە؟

- پەرستشی خوای گەورەیە.

- پەرستش یانی چی؟

- پەرستش (عیبادەت) بەندەیی کردنە بۆ ئەو پەروەردگارەی کە بەدیهێنەری هەموو جیهانەکانە. کەمێك بەر لە ئێستا ڕکووعمان بۆ برد و لە حزووریدا کڕنووشمان بۆ برد. ئەی عەلی! بەندایەتییمان هێنایە جێ. ئەوجا پێغەمبەر ﷺ داوای لێکرد و فەرمووی تۆش لەگەڵمان بە.

بەڵام پرسیارەکانی عەلی هێشتا تەواو نەبووبوون.

- مەبەستت چیە؟

- مەبەستم ئەوەیە ببە بە موسوڵمان. تۆ بانگ دەکەم بۆ دینی ئەو خوایەی کە تاك و تەنهایە و هیچ هاوەڵ و هاوشێوەیەکی نیە.

سەروەرمان ﷺ بەردەوام بوو و، فەرمووی:

- ئایا ڕازی ئەبیت ئەی عەلی؟

چاوە ڕەشە گەورەکانی عەلی بریسکانەوە:

- بەڵام ئەمە شتێکە تا ئێستا نەمبیستووە، تاکو لەگەڵ باوکم قسە نەکەم ناتوانم بڕیار بدەم.

پێغەمبەر ﷺ لەبەرئەوەی تا ئەو کاتە پەیامەکەی ئاشکرا نەکردبوو، نەیدەویست خەڵك بیبیستێ، بۆیە حەزرەتی عەلی ئاگادار کردەوە و، فەرمووی:

- ئەی عەلی! ئەو شتانەی کە پێم وتیت ئەگەر قبووڵت کرد، ئەوا باشە. ئەگەرنا، با بە نهێنی لای خۆت بمێنێتەوە و لای کەس باسی مەکە.

حەزرەتی عەلیش - خوا لێی ڕازی بێت- بەڵێنی دا ئەم نهێنییە لای کەس نەدرکێنێ. دواتر ماڵی سەروەرمانی بەجێهێشت.

حەزرەتی عەلی ئەو شەوەی بە بیرکردنەوە بەسەر برد. لەگەڵ هەڵهاتنی خۆردا، خۆری حەقیقەت لە ناخی ئەویشدا هەڵهاتبوو و گومانەکانی دڵی ڕەویبوونەوە و بڕیاری خۆی دابوو. هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا و، وتی:

- دوێنێ تۆ چیت پێ وتم؟

- شایەتی بدەیت کە جگە لە خوای تاك و تەنها هیچ خوایەکی تر نییە، ئەو زاتە بێ هاوەڵ و بێ شەریکە. لات و عوززا و سەرجەم بتەکان بێ کەڵکن و سوود وزیانیان بۆ خۆیان نییە، چ جای بۆ کەسانی تر. ئینجا ئازیزمان ﷺ بە زمانە شیرینەکەی پێی فەرموو کە خۆی بپارێزێت لەوەی هەرکامێکیان بکات بە هاوەڵی خوای گەورە. دواتر لە حەزرەتی عەلی پرسی:

- ئایا پرست بە باوکت کرد؟

لە بەرامبەر ئەمەدا حەزرەتی عەلی بەمجۆرە وەلآمی پێغەمبەری دایەوە:

- کاتێك پەروەردگار منی دروستکرد، پرسیاری لە باوکم نەکرد، تا ئەوەی ئێستا من بۆ پەرستنی پەروەردگارم پرسیار لەو بکەم.

ئیتر بەم شێوەیە حەزرەتی عەلی شایەتومانی هێنا و چووە ڕیزی موسوڵمانە یەکەمینەکانەوە و بوو بە یەکێك لە یەکەمین نوێژکەران.

*** 

# حەزرەتی ئەبوبەکر

زانا بەساڵاچووەکە لە ژوورەکەیدا ئۆقرەی نەدەگرت، هەر بەملا و ئەولادا دەهات و دەچوو. لە خۆشیدا لێدانی دڵی زیادی کردبوو و دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو. ناوە ناوە دەستی دەخستە ژێر چەناگەی و دەکەوتە بیرکردنەوە. ئینجا پرسیاری ئاڕاستەی میوانەکەی دەکرد. ئەو وەڵامانەی وەری دەگرت، جۆش و خرۆشی زیاتر کردبوو.

میوانێکی پیرۆز هاتبووە ماڵەکەیەوە و زانیاری لەسەر ئەو کەسە دەدایە کە چەندین ساڵە ئەم بەدوایدا وێڵە.

حەزرەتی ئەبوبەکر نانەکەی تەواو کردبوو و شەربەتی دەخواردەوە. ڕاستییەکەی، تێنەدەگەیشت بۆچی وا ئەم زانا بە تەمەنە بە دەوریدا دەسووڕێتەوە و بەم ئەندازەیە ڕێزی لێدەگرێت.

پاشان زاناکە ڕۆشتە بەرامبەر حەزرەتی ئەبوبەکر و، وتی:

- تەنها یەك شت ماوە کە دەمەوێت بیزانم!

- دەبێ ئەو شتە چی بێت؟

زانا بەسالاَّچووەکە لەناکاو کەوتە سەر چۆك و، وتی:

- با "سك"ت ببینم.

حەزرەتی ئەبوبەکر سەری سوورِمابوو، نەیدەزانی چۆن وەلاَمی بداتەوە. پاش کەمێك بیرکردنەوە، وتی:

- تا پێم نەڵێیت بۆچیتە پیشانت نادەم.

زانا بەسالاَّچووەکە تەماشایەکی ناوچاوی حەزرەتی ئەبوبەکری کرد. بە دەم بیرکردنەوەوە لەوەی کە کاتی ئەوە هاتووە بگات بەوەی کە چەندین ساڵە چاوەڕێیەتی، ئەم قسانەی لە زار هاتنە دەر:

- کتێبە پیرۆزەکان هەواڵی هاتنی پێغەمبەرێکیان داوە. ئەو پێغەمبەرە لە مەککە دەردەکەوێت. ئەوەندە دەزانم کە گەنجێك و کەسێکی تەمەن کامڵ دەبنە یارمەتیدەری. بۆی هەیە ئەو کەسە کامڵە تۆ بیت. کەسێکی سپیکەلانە و لاوازیت، دەبێت لەسەر سکیشت نیشانەیەك هەبێت. هەموو مەبەستەکەم ئەمەیە، جا کە ئێستا تۆش زانیت، ئیتر سکتم پیشان بدە.

حەزرەتی ئەبوبەکر لەسەر چۆك وەستا و پۆشاکەکەی لەسەر سکی لابرد. زانا بەسالاَّچووەکە کە نیشانەکەی سەر سکی بینی، لە خۆشیاندا هاواری کرد و، وتی:

- تۆ ئەو کەسەیت کە من وتم. بەڵێ، تۆ دەبیتە یارمەتیدەری.

ئەو حەزرەتی ئەبوبەکرەی کە لە خراپەکانی سەردەمی نەفامی (جەهالەت)دا خۆی بەدوور دەگرت، بەم هەواڵە زۆر دڵخۆش بوو. لەگەڵ زانا بەساڵاچووەکەدا بەدوور ودرێژی قسەیان کرد. زانیاری تەواوی لەسەر ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوانکراوە لێ وەرگرت کە لە داهاتوودا دەهات. ئەو زانیارییانەی کە بەدەستی هێنا، بەس بوون بۆ ئەوەی بە ئاسانی ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوانکراوە بناسێتەوە.

پاش چەند ڕۆژێك ئەو کاروانەی کە حەزرەتی ئەبوبەکریشی تێدا بوو، لە یەمەنەوە بەرەو مەککە گەڕایەوە.

زۆر شەکەت و ماندوو بووبوون، چونکە چەند ڕۆژێك بوو بەڕێگاوە بوون. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە هەوای گەرمی بیابان و خۆرە سووتێنەرەکەی هەڵیقرچاندبوون.

هەر کە لە دوورەوە مەککەیان بەدیکرد، کەوتنە خەیاڵی ئەوەی کە چۆن ماندوێتییان دەربکەن و لە ئاوە سازگار و فێنکەکەی مەککە بخۆنەوە. لەلایەکی تریشەوە کەیف خۆش بوون بەوەی کە بازرگانییەکی پڕ قازانجیان ئەنجام داوە.

بەڵام حەزرەتی ئەبوبەکر جیاواز لەوان، لە بیری شتێکی تردا بوو. لەژێر کاریگەری ئەو زانیارییانەدا بوو کە زانا بەساڵاچووەکە پێی وتبوو. مژدەی ئەوەی پێدرابوو کە پێغەمبەرێك دێت و ئەمیش دەبێتە یارمەتیدەری ئەو پێغەمبەرە. تۆ بڵێیت ئەو پێغەمبەرە کێ بێت؟

کاتێك ئەبوبەکر گەڕایەوە ماڵەوە، شەیبە و ئەبوجەهل و کۆمەڵێك لە برادەرانی تری هاتن بۆ سەردانی. ئەویش لێی پرسین:

- کە من لێرە نەبووم هیچ شتێکی گرنگ ڕوویداوە؟

- جا چی ڕوینەداوە! کوڕەزا بێ باوکەکەی عەبدولموتەلیب بانگەشەی ئەوە دەکات کە بووە بە پێغەمبەر. ئێمەش چاوەڕێی گەڕانەوەی تۆمان دەکرد. بڕۆ بۆلای، چی پێ دەڵێی پێی بڵێ، تۆ نزیکترین هاوەڵی ئەویت. ئەگەر تۆ نەبوویتایە، زۆر دەمێك بوو لەناومان بردبوو. بەمشێوەیە لای حەزرەتی ئەبوبەکر سکالآیان لە دەست پێغەمبەری خوا کرد.

حەزرەتی ئەبوبەکر پاش ئەوەی میوانەکانی بە جوانی بەڕێکرد، خێرا بەرەو ماڵی پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت و لەدەرگای دا. لەگەڵ بینینی پێغەمبەری خوادا وتی:

- ئەی موحەممەد ئەو هەواڵە ڕاستە کە دەربارەی تۆ بە منیان گەیاندووە؟

پێغەمبەری خودا ﷺ بزەیەکی کرد و، فەرمووی:

- ئەی ئەبوبەکر! ئەو هەواڵە چییە دەربارەی من بە تۆ گەیشتووە؟

- ئەوەیە کە تۆ بانگی خەڵکیت کردووە بۆ باوەڕ هێنان بە خوای تاك و تەنها و وتووتە من نێردراوی پەروەردگارم.

- بەڵێ ئەبوبەکر! خوای گەورە منی وەك پێغەمبەر بۆ تۆ و سەرجەم مرۆڤایەتی ڕەوانەکردووە. مرۆڤەکان بۆلای خوای تاك و تەنها بانگهێشت دەکەم. تۆش ئیمان بهێنە.

حەزرەتی ئەبوبەکر زۆر چاك دەیزانی کە هاوەڵە ئازیزەکەی کەسێکی ڕاستگۆ و دەستپاکە و خاوەنی ئاکار و ڕەوشتی بەرز و جوانە. بەڵام خوازیار بوو بەڵگەیەکی بەدەستەوە بێت.

- باشە بەڵگەت چییە بۆ ئەمە؟

پێغەمبەر ﷺ بە حاڵی ئەبوبەکری دەزانی، بۆیە بە زەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دایەوە و، فەرمووی:

- بەڵگەم ئەو زانا بەساڵاچووەیە کە لە یەمەن بینیت.

کاتێکیش سەروەرمان ﷺ قسەکانی زانا بەساڵاچووەکەی بۆ گێڕایەوە، حەزرەتی ئەبوبەکر لە دڵەوە باوەڕی پێکرد و، وتی:

- وەڵلاهی من تا ئێستا درۆم لە تۆ نەبیستووە! شایانی ئەوەیت کە وەك پێغەمبەر بنێردرێیت.

ئیتر دوای ئم قسانە، ئەویش شایەتومانی هێنا و موسوڵمان بوو. پێغەمبەر ﷺ بە موسوڵمانبوونی ئەبوبەکر زۆر دڵخۆش بوو. لەدوای ئەمەوە ئەبوبەکری ژیر و خاوەن ئاکاری بەرز، بوو بە ڕێپیشاندەری زۆرێك لە هاوڕێکانی تا بە کۆتا پێغەمبەر و ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئاشنا بن.

***

# کۆیلە

کاتی نیوەڕۆ بوو. بازاڕ جمەی دەهات لە خەڵك. لە لایەك فرۆشیارەکان هاواریان دەکرد، لەلایەکی تریش کڕیارەکان بەدوای شمەکی باشدا دەگەڕان تا بیکڕن.

یەکێك لەو بازرگانانەی کوتاڵی دەفرۆشت، ڕۆشتە شوێنێکی بەرز و ویستی بە دەنگی بەرز سەرنجی کڕیارەکان بۆ لا خۆی ڕابکێشێت. لەو کاتەدا کۆمەڵە منداڵێك هاتنە بازاڕەکەوە. پەتێك بە دەستی ئەو منداڵەیانەوە بوو کە لە پێشی کۆمەڵەکەوە دەڕۆیشت. پەتەکەش لە ملی کۆیلەیەکی ڕەش پێست بەسترابوو.

منداڵەکان ژاوەژاوێکی زۆریان لە بازاڕەکەدا نایەوە. لەلایەك پێدەکەنین و لەلایەکی تریش ئازاری کۆیلە ڕەشەکەیان دەدا و گاڵتەیان پێدەکرد. ئەو کۆیلەیە "بیلالی حەبەشی" بوو.

بیٚ ئەوەی وەڵامی ئەو کەسانە بداتەوە کە ئازاریان دەدا و سووکایەتییان پێدەکرد، لەمسەر بۆ ئەوسەری بازاڕەکە ڕۆیشت. خەڵکەکە وتەی زۆر ناشیرینیان پێدەوت:

- سەیری حاڵی ئەوە بکە. چووەتە سەر دینەکەی موحەممەد!

- ئەوەی پێی ئەکەن هێشتا کەمە!

- شایانی زیاترە!

هەندێ جار خۆڵ و بەردیشیان تێ دەگرت. حەزرەتی بیلال تەنها لەبەر ئەوەی دەیوت "خودا یەکە"، لەلایەن خاوەنەکەیەوە ئازار و ئەشکەنجەی زۆر دەدرا. هەندێك جار بۆ چەندین کاتژمێر بێ نان و ئاو کاریان پێدەکرد، هەندێك جاری تریش بەمشێوەیە پەتیان دەکردە ملی و بەناو بازاڕدا دەیانگێڕا.

"ئومەییەی کوڕی خەلەف" کە خاوەنی بیلالی چاونەترس بوو، هەرچی کرد نەیتوانی بیلال پاشگەز بکاتەوە. لە کۆتاییدا لەسەر لمە داخ بووەکەی بیابانەکە پاڵی خست و ئەشکەنجەی دا. بتێکی بەدەستەوە بوو. ڕووی کردە بیلال و هاواری بەسەردا کرد:

- باوەڕ بە لات و عوززا بهێنە!

حەزرەتی بیلال کە زۆر بە زەحمەت دەیتوانی چاوەکانی هەڵبهێنێت و قسە بکات، لێوەکانی دەجوڵانەوە و، دەیوت:

- أحدٌ...أحد! خوا تاك و تەنهایە...خوا تاك و تەنهایە!

کاتێك ئومەییە ئەم قسانەی بیست، هەروەك شێت تووڕەیی گرتی و قیڕاندی:

- ئادەی ئەو بەردە بهێنن و بیخەنە سەر سکی!

خزمەتکارەکانی دەستیانکرد بە پاڵنانی بەردێکی گەورە. ئومەییە بۆ دواجار ڕووی کردە بیلال و هەمان شتی لێ پرسییەوە، بەڵام کە بینی وا بیلالی ڕۆح بەرز و خۆڕاگر هەمان وەڵام دەداتەوە، خۆی پێڕانەگیرا و هاواری کرد:

- بەردەکە لەسەر سکی بشکێنن!

ئەوەی ئومەییە وتی جێبەجێیانکرد. لەبەر گەورەیی بەردەکە، حەزرەتی بیلال زۆر بە ناڕەحەتی هەناسەی بۆ دەدرا. لەو کاتەدا حەزرەتی ئەبوبەکر بەوێدا تێپەڕی. بەرگەی ئەو دیمەنەی نەگرت، بۆیە بڕیاری دا حەزرەتی بیلال ڕزگار بکات. ئومەییە کە لە نیازەکەی حەزرەتی ئەبوبەکر تێگەیشت، ڕووی کردە حەزرەتی ئەبوبەکر و، پێی وت:

- ئێوە بیلالتان تێکدا. گەر دەتەوێت ڕزگاری بکەیت، ئەوا بیکڕە و ڕزگاری بکە.

حەزرەتی ئەبوبەکریش فەرمووی:

- من کۆیلەیەکم هەیە لەسەر بیروباوەڕی تۆیە و زۆر لە بیلالیش بەهێزترە، جا ئایا ڕازی دەبیت لەگەڵ بیلالدا ئاڵوگۆڕیان پێ بکەین؟

ئومەییە ئەم مامەڵەیەی زۆر بەدڵ بوو. بەڵام وتی:

- ڕازیم، بەڵام ئەگەر لەگەڵ کۆیلەکەدا، ژنەکەی و کچەکەیشیم نەدەیتێ، قبووڵی ناکەم.

کاتێك حەزرەتی ئەبوبەکر ڕەزامەندی دەربڕی، ئومەییە کەوتە بیانوو گرتن و دەیویست لە پاڵ ئەوانەدا شتی تریش بەدەست بهێنێت، بۆیە بە لەخۆڕازیبوونێکەوە وتی:

- ئەبێ دووسەد دیناریشم لەگەڵیدا بدەیتێ، ئەگەرنا پاشگەز دەبمەوە.

حەزرەتی ئەبوبەکر ئەم داواکارییانەی ئومەییەی بەدڵ نەبوو.

کاتێك ئومەییە هەستی بەمە کرد، وتی:

- نیگەران مەبە، هیچی تر داوا ناکەم.

ئیتر حەزرەتی ئەبوبەکر ڕازی بوو کە دوو سەد دیناریشی بداتێ و دواجار حەزرەتی بیلالی لێکڕی. بەم شێوەیە حەزرەتی بیلالی لەدەست ئومەییە ڕزگار کرد.

پاشان ڕۆشت بۆلای پێغەمبەر ﷺ. سەروەرمان بەم کارەی زۆر دڵخۆش بوو، بە حەزرەتی ئەبوبەکری فەرموو:

- ئەی ئەبوبەکر، لە بەرامبەر ئەوەدا داوای هیچت لێکرد؟

- نەخێر، ئەی پێغەمبەری خوا، ئازادم کرد.

حەزرەتی بیلال لەپاش ئازادبوونی، لە پێغەمبەر ﷺ جیا نەدەبووەوە.

چەندین ساڵ بانگبێژی پێغەمبەر بوو و خەڵکی بۆ نوێژ بانگ دەکرد.





# بانگهێشت کردن

لە مەککە ڕۆژێکی نوێ دەستی پێکرد. "صەفییە"ی پوری پێغەمبەر زۆر دوودڵ بوو. خۆی گۆڕی و ڕۆشتە دەرەوە. لەسەر شەقامەکان شاعیرەکان دەگەڕان و شیعریان دەوت. هەندێك لە خەڵکی ئەو بتانەی دروستیانکردبوو، دەیانبردن بۆ کەعبە. هەندێکی تریش بتەکانیان خاوێن دەکردەوە. بازاڕ کرابووەوە و ڕووی لە قەرەباڵغی

دەکرد. صەفییە بە خێرایی هەنگاوی دەنا، بیری لەوە دەکردەوە کە تۆ بڵێیت پێغەمبەر ﷺ هیچی بەسەر نەهاتبێت؟ یان نەخۆش نەکەوتبێت، وا ماوەیەکی زۆرە لە ماڵ نەهاتۆتە دەرەوە. پوورەکانی تریشی کۆ کردەوە و ڕۆشتن بۆ ماڵی پێغەمبەرﷺ. ئازیزمان ﷺ پێی فەرموون:

- سوپاس بۆ خوا هیچم نییە، بەڵام خوای گەورە فەرمانی پێکردووم کە خزمە نزیکەکانم بە سزای خوایی بترسێنم. دەمەوێت بەنوعەبدولموتەڵیبیش کۆ بکەمەوە و بانگیان بکەم بۆ باوەڕ هێنان بە خوای گەورە.

پوورەکانی سەروەرمان پێشنیاری ئەوەیان بۆ کرد کە جگە لە ئەبولەهەب، هەموو خزمەکانی تری بانگهێشت بکات. ئەمەیان وت و لەلای پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتن. خوای گەورە پێغەمبەری ئاگادار کردبووەوە کە چۆن دەست بکات بە بانگەوازی ئاشکرا. بۆ ئەم مەبەستە پێغەمبەر ﷺ حەزرەتی عەلی بانگ کردە لای خۆی و، پێی فەرموو:

- خواردنێك لە گۆشت ئامادە بکە کە بەشی یەك کەس بکات، لەگەڵ جامێك شیردا. دواتر کوڕەکانی عەبدولموتەڵیب کۆ بکەرەوە. قسەیان لەگەڵدا دەکەم و پەیامی سەرشانمیان پێ ڕادەگەیەنم.

میوانەکان وردە وردە دەهاتن بۆ ماڵی پێغەمبەرﷺ. هەموویان خولیای ئەوەیان بوو بزانن چی ڕوودەدات. کاتێك بینیان لە ژوورەوە خواردنی تەنها یەك کەس و جامێك دانراوە، سەریان سووڕما. لەنێوان خۆیاندا دەستیان کرد بە چپە چپ. ئەبولەهەب خۆی پێنەگیرا و، وتی:

- تەماشای ئەوە بکەن! دەیەوێت بە قاپێك خواردن تێرمان بكات. بە تەنها خۆشم بم، تێری پێناخۆم.

یەكێكی تر لەولاوە بە پێکەنینەوە وتی:

- دەشڵێ من پێغەمبەرم!

سەروەرمان ﷺ بەم قسە زبرانە زۆر دڵگران بوو. بەڵام بێ ئەوەی هیچ دەربېڕێت، "بسم الله"ی کرد و گۆشتەکەی پارچە پارچە کرد. ئەوانەی هاتبوون دەستیانکرد بە نانخواردن. لەگەڵ هەر پارووییەکدا سەرسامییان زیادی دەکرد. سەرەڕای ئەوەی دەشیانخوارد، کەچی نە خواردنەکە کەمی دەکرد، نە شیرەکە. لە بەرامبەر ئەم "موعجیزە"یەدا دۆش دامابوون. ئا لەم کاتەدا کە خەریك بوو هەندێکیان دڵیان نەرم دەبوو، ئەبولەهەب هاتە قسە و سووکایەتی بە پێغەمبەری نازدار کرد:

- تا ئێستا جادووی وام نەبینیوە!

پاشان پێغەمبەر ﷺ باسی خوای تاك و تەنهای بۆ کردن و ئایینی ئیسلامی بۆ ڕوونکردنەوە.لە کۆتایی قسەکانیشیدا پێی فەرموون:

-کێ لە ئێوە دەبێتە یارمەتیدەرم؟

خزمەکانی کە تێری سکیان نان و شیریان خواردبوو، بێدەنگیان هەڵبژارد و سەریان شۆڕ کرد. لە کاتێکدا کە هیچ کام لە ئامادەبووان قسەیان نەکرد، حەزرەتی عەلی هەستایە سەر پێی، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو:

- تۆ دانیشە!

سێ جار لەسەر یەك هەمان پرسیاری دووبارە کردەوە، لە هەرسێکیاندا بە تەنها حەزرەتی عەلی وەڵامی دەدایەوە و، دەیفەرموو:

- یارسول الله من دەبمە یارمەتیدەرت.

هەندێکیان گاڵتەیان بە قسەی ئەم منداڵە "دوانزە" ساڵە دەهات و، دەیانوت:

- جا چی دەبێت، منداڵێکی بچکۆلانەیە. دەبێ چی لەدەست بێت!

ئیتر بەم شێوەیە گرنگییان بە بانگهێشتەکەی پێغەمبەر ﷺ نەدا و ئەو ناوەیان بەجێهێشت. بەڵام پێغەمبەری خوا لە ڕۆژەکانی دواتردا هەر بەردەوام بوو لە باسکردنی ئیسلام بۆ خەڵکی.

***



## له پەیامەكەم پاشگەز نابمەوە

شەقامەكانی مەككە قەرەباڵغی پێوە دیار بوو. ژمارەی كڕیار و فرۆشیارەكان زیادی كردبوو. لەو ڕۆژانەی دواییدا ژمارەی ئەو كاروانانەی دەهاتن، ڕووویان لە زیادبوون كردبوو. لەنێو كۆڵانەكانەوە "ئەبوسوفیان" دەركەوت،كە یەكێك بوو لە پیاوە گەورەكانی مەككە. بە

دواشیدا کۆیلەکەی، بەخۆی و باوەشێنەکەی دەستییەوە. بەناو فرۆشیارەکاندا ڕۆیشت و چووە ناو کۆڵانێکەوە. لەبەردەم خانوویەکی سپی گەورەدا وەستا. ئەو خزمەتکارەی لە دەرەوە چاوەڕێی دەکرد، بەڕێزەوە ڕێی پیشاندا و فەرمووی لێکردە ژوورەوە. کە ڕۆیشتە ناو هۆڵە گەورەکەوە، زانی کە ئەبوجەهل زۆر تووڕەیە. ئەبوجەهل دەستی برد بۆ ترێکەی بەردەمی. هێشوویەکیشی بۆ ئەبوسوفیان لێکردەوە و، وتی:

- بەخێربێیت ئەبوسوفیان، ئێمەش چاوەڕێی هاتنی تۆمان دەکرد.

ئەبوسوفیان لە بابەتەکە تێنەگەیشتبوو، ڕوونکردنەوەی دەویست. وەلیدی خاوەن ماڵ لە شوێنی خۆی هەستایەوە. هەموویان بێدەنگ بوون و ڕوویانکردە ئەو. وەلید وتی:

- کەمی ماوە بۆ وەرزی حەج. هەر لە ئێستاوە کاروانەکان دەستیانکردووە بە هاتن. ئەوانەی کە دێن بە دڵنیاییەوە دەربارەی موحەممەد پرسیاریان دەبێت.

ئەمەی وت و ڕووی گرژکرد. ئەوجا چاوی بە ئامادەبوواندا گێڕا و، بە ڕەقی پێی وتن:

- مادام وایە، چییان پێدەڵێن؟

پرسیارەکە ڕق و تووڕەیی لە دەموچاوی هەموویاندا دروست کرد. ئەبوجەهل وەك نەریتی هەمیشەیی، بەردەوام بوو لەسەر بوختان و تۆمەتە ناڕەواکانی، بۆیە ئەم پێشنیارەی خستە بەردەمیان:

- دەڵێین جادووگەرە، کاهینە! ئیتر بەمشێوەیە کەس باوەڕی پێناکات.

خاوەن ماڵ لە شوێنی خۆی دانیشتەوە و ڕوانینەکانی بڕییە دیوارەکە و، وتی:

- بەمجۆرە هەریەکە و بە شێوەیەکی جیاواز بیر دەکاتەوە، یەکتری بەدرۆ دەخەنەوە و ڕێك ناکەون.

پاش وەلید، ئەبولەهەب هاتە گۆ:

- ڕاست دەکات. دەبێت پێکەوە بڕیار لەسەر قسەیەك بدەین و هەموومان یەك شت بڵێین.

وەلید دەیزانی قسەکانیان سەرەنجامێکی نابێت، بۆیە وتی:

- قسەکانتان زۆر بێ کەڵك و نابەجێیە.

ئەوجا بێدەنگ بوو. دواتر سەری بەرزکردەوە و، وتی:

- بەڵام بە بڕوای من هەروا باشە پێی بڵێین جادووگەرە.

خزمەتکارەکان خواردنەوەی ساردیان هێنا. ئەبوجەهل بە بڕوای خۆی بیرۆکەیەکی باشی بۆهاتبوو. بۆیە دەستبەجێ وتی:

- با لەگەڵ مامیدا قسە بکەین.

ئەبولەهەبیش لەولاوە خۆی شپرزە کرد و، وتی:

- دڵنیام دووبارە قسە بە بتەکانمان دەڵێنەوە و دینەکەی خۆیان بە ئاشکرا بڵاو دەکەنەوە. ئیتر کاتی هاتووە کۆتایی بەمە بهێنین.

ئەوانیش هەمان ڕایان هەبوو. دوای تەواوکردنی خواردنەکەیان، هەموویان پێکەوە ڕۆیشتنە دەرەوە. پاش کەمێك لە دەرگای ئەبوتالیبیان دا و، وتیان:

- ئەی ئەبوتالیب! برازاکەت تەواو ناخۆشی کردووە. قسە بە بتەکانمان دەڵێت و ئایینی باو و باپیرانمان بە پڕوپووچ دەزانێ. با برازاکەت پاشگەز ببێتەوە لەوەی دەیکات و دەست هەڵبگرێت لە قسە وتن بە باو و باپیرانمان ئیتر گاڵتە بە خواکانمان نەکات. پێی بڵێ با لە بانگەوازەکەی پاشگەز ببێتەوە. ئەگەر دەیەوێت دەیکەین بە پێشەوا و سەرکردەی خۆمان. خۆ ئەگەر سامانی دەوێت، ئەوا دەوڵەمەندی دەکەین و لە ماڵ و سامانی خۆمانی دەدەینێ. لەگەڵ جوانترین کچی مەککەدا زەماوەندی بۆ دەکەین. بەس تەنها لە بانگەوازەکەی پاشگەز ببێتەوە.

بۆ ماوەیەك بە بێدەنگی تەماشای یەکتریان کرد.ئەوجا دوا قسەی خۆیان کرد:

- یان واز لەو کارانە دەهێنێت، یاخود تا ئەوەی لایەکمان لەناو دەچێت، بەرەنگاری دەبینەوە.

ئەو قسەیەی کۆتاییان، ناخی ئەبوتالیبی بریندارکرد. تا ئێستا برازاکەی پاراستبوو، بەڵام ئێستا بێباوەڕەکان باسی بەرەنگاربوونەوە دەکەن.

ئەبوتالیب نەیدەویست لەلایەن هۆزەکەیەوە پشتگوێ بخرێت. هەروەها ویژدانیشی ڕێی نەدەدا برازاکەی ڕادەستی ئەوان بکات. بۆیە وتی:

- با من قسەیەکی لەگەڵدا بکەم.

پیاوێکی نارد بە دوای سەروەرماندا. پێغەمبەرمان ﷺ هات. ئەبوتالیب لەبەردەم خۆیدا داینا. بەوە دەستی کرد بە قسەکانی کە سەرانی قورەیش هاتوون بۆ لای، ئینجا باسی ئەوەی بۆ کرد کە ناتوانێت بە تەنها بەرەنگاری هەموو سەرانی هۆزەکەی ببێتەوە.

- گەورە پیاوانی مەککە هاتنە لام و داوایان لێکردم ئاگادارت بکەمەوە کە واز لە قسە وتن بە بتەکانیان بهێنیت و پەیوەندیت بە دینەکەی ئەوانەوە نەبێت. دواتر پێشنیازەکانی بێباوەڕانی پێ ڕاگەیاند. ئەبوتالیب زۆر دڵگران بوو، بە دەنگێکی کزەوە دوا قسەی خۆی کرد:

- بەزەییت بە خۆت و منیشدا بێتەوە. منیش و خۆیشت مەخەرە ژێر بارێکەوە کە نەتوانین بەرگەی بگرین!

پێغەمبەرمان ﷺ بەم قسانە زۆر خەمبار بوو. هەستی کرد کە لەمەولا مامی ناتوانێت یارمەتی بدات و پشتی بگرێت. بۆ ماوەیەك بە غەمگینی بیری کردەوە، ئینجا وتی:

- مامە! ئەگەر خۆر بخەنە لای دەستی ڕاستم و مانگیش بخەنە لای دەستی چەپم تاکو واز لە بانگەوازەکەم بهێنم، سوێند بە خوا واز ناهێنم.

کاتێك پێغەمبەری خوا ئەم قسانەی دەکرد، چاوی پڕ بووبوو لە فرمێسك. دواتر هەستایە سەر پێ و بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت. ئەبوتالیب بە حاڵی برازاکەی زۆر دڵگران بوو. بۆیە بانگی کرد و، وتی:

- وەرە برازا خۆشەویستەکەم!

کاتێك پێغەمبەرمان ﷺ گەڕایەوە، مامی پێی وت:

- چیت ویست بیکە، ویستت چی باسبکەیت باسی بکە. مامت هەمیشە لە پشتتە و دەتپارێزێت.

ئینجا باوەشی پێدا کرد و، وتی:

- هەرگیز بە تەنها جێت ناهێڵم.

ئەمەی وت و لە ژوورەکە چووە دەرەوە.

بێباوەڕان بەتاسەوە چاوەڕێی ئەنجامەکەیان دەکرد. هەرکە ئەبوتاڵیب وەڵامەکەی پێغەمبەری دانەوە، دەموچاویان گرژبوو. لەبەر ئەمە هەڕەشەیان لە ئەبوتاڵیب کرد و، وتیان:

- ئێمە بەرپرسیار نین لەوەی بەسەر برازاکەتدا بێت.

ئەمەیان وت و بە ڕق و قینەوە ماڵەکەیان بەجێهێشت. پاش ئەوەی ڕۆشتنە دەرەوە، ئەبوجەهل لە تووڕەییدا کەوتە گیانی کۆیلەکەی و دای بە زەویدا. موشریکەکان لە تاو کاریگەری بەدەست نەهێنانی ئەوی دەیانویست، بەردەوام بوون لە پیلان و گێچەڵ گێڕان.

***



# مانگ دەبێت بە دوو لەتەوە

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵەکانیدا دانیشتبوو، قسەی بۆ دەکردن. بەو وتە گەوهەر ئاسایانەی کە لە نێوان لێوە نوورانییەکانیەوە دەهاتنە دەر، ڕۆحی هاوەڵەکانی جۆش دابوو. حەزیان نەدەکرد ئەو کاتەیان لێ

بڕوات. هیچ کەسیان بەرگەی ئەوەی نەدەگرت کە یەکێك بێت و کۆڕەکەیان لێ تێکبدات.

لەو کاتەدا کۆمەڵێك لە قوڕەیشییەکان هاتن. ئەبوجەهلیشیان لەناودا بوو. بە دەموچاویاندا دیاربوو کە بۆ هەواڵ پرسین نەهاتبوون. یەکێکیان هاتە دەرەوە لە ناویاندا و، بە پێغەمبەرمانی وت:

- مادەم دەڵێیت من پێغەمبەرم، موعجیزەیەکمان پیشان بدە با ئێمەش باوەڕ بکەین. بۆ نموونە ئەو مانگە لە ناوەڕاستدا بکە بە دوو کەرتەوە. دەتوانی ئەوە بکەی؟

پێغەمبەرمان ﷺ هیچ خۆی تێکنەدا بە داواکەیان و بە هێمنی لە هەموویانی ڕوانی، ئینجا چاوی بڕییە مانگ. لە ئاسماندا تەنها یەك پەڵە هەوریش نەبوو. ئەستێرەکان هێدی هێدی دەردەکەوتن. مانگ لە جوانترین شێوەیدا بوو. وەکو سینییەکی خڕ لەناو ئەستێرەکاندا خۆی دەنواند. پێغەمبەر ﷺ لێی پرسین:

- ئەگەر ئەوە بکەم باوەڕ دەهێنن؟

قوڕەیشییەکان بە بێ دوودڵی بە یەکدەنگ وەڵامیان دایەوە و، وتیان:

- بەدڵنیاییەوە باوەڕ دەهێنین. تۆ تەنها ئەو موعجیزەیەمان پیشان بدە.

پێغەمبەر ﷺ لەپێشدا لە خوای گەورە پاڕایەوە. لە پاشاندا هەستایە سەر پێ. پەنجەی شایەتومانی بەرزکردەوە و ئاڕاستەی مانگی

کرد. ئینجا هەروەکو ئەوەی شتێك ببڕێت، لەسەر شێوەی پیتی ئەلف (أ) پەنجەی لەسەرەوە هێنایە خوارەوە.

لەو کاتەدا ئەوانەی لەوێ بوون هەموویان دۆش دامان. تەنها بێباوەڕەکان نەبوو کە سەریان سوورمابوو، بەڵکو هاوەڵەکانی پێغەمبەریش ﷺ واقیان وڕمابوو. تەماشای ئەو موعجیزەیەیان دەکرد کە بە بەرچاوی خۆیانەوە ڕوویدەدا. مانگ بەتەواوی لە ناوەڕاستدا بووبوو بە دوو لەتەوە. لەتێکی ڕۆیشتبووە سەر کێوی "ئەبوقوبەیس"، لەتەکەی تریشی ڕۆیشتبووە سەر کێوی "قوعەیقوعان". لەنێوانیشیاندا مەودایەکی زۆر هەبوو. پاشان پێغەمبەر ﷺ ڕووی کردە هاوەڵەکانی و، فەرمووی:

- ئێوە بەشایەت بن! ئێوە بەشایەت بن!

ئەبوجەهل دەستی دەهێنا بە چاویدا و دووبارە و سێبارە دەیڕوانییەوە مانگ. نەیدەزانی چی بڵێت و چی بکات. کە تۆزێك هاتەوە سەر خۆی، دیاربوو بەڵێنەکەی بیرچووبووەوە کە تۆزێك لەوەو پێش دابووی. بۆیە وتی:

- جادووی منداڵە بێباوکەکەی ئەبوتالیب کاری کردە سەر ئاسمانیش!

پێغەمبەر ﷺ بەم قسەیە زۆر دڵگران بوو. لەو کاتەدا هەردوو کەرتەکەی مانگ وردە وردە لەیەك نزیك دەبوونەوە. تا لەکۆتاییدا ئەو بەینەی لە نێوانیاندا دروست بووبوو، بەتەواوی نەما و وەکو شێوەی پێشووی لێهاتەوە. یەکێك لە موشریکەکان وتی:

- سیحری لێمان کرد. بەڵام با بزانین ئایا ئەوانەش کە ئێستا بەرێوەن بەرەو مەککە، هەمان ڕووداویان بینیوە؟ خۆ ئەگەر ئەوان نەیانبینیبێ، ئەوا موحەممەد بە تەواوی سیحری لێکردوین. جا خۆ موحەممەد ناتوانێ سیحر لە هەموو خەڵکی بکات!

هەموویان بە پەرۆشییەوە چاوەڕێیان دەکرد. دوای ماوەیەکی زۆر، کاروانێك هاتە شارەوە. بێباوەڕان بە تاسەوە بەرەو ڕووی ڕۆیشتن. بەڵام کاتێك نزیك بوونەوە لێیان، بە دەموچاویاندا بۆیان دەرکەوت کە ئەوانیش لە سەرسامییەکی زۆردا بوون. لەکۆتاییدا بۆیان دەرکەوت کە ئەو موعجیزەیە لەلایەن خەڵکی تریشەوە بینراوە. بەمجۆرە بێباوەڕان هیچیان بۆ نەمایەوە. ئیتر بۆیە بە ئاشکرا هەمان قسەیان دووبارە دەکردەوە و، دەیانوت:

- ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە!

زۆری نەبرد خوای گەورە ئەو موعجیزەیەی لە ڕێی سرووش (وەحی)ەوە بۆ هەموو کەس ئاشکراکرد.

﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ۝١ وَإِن يَرَوۡاْ ءَايَةً يُعۡرِضُواْ وَيَقُولُواْ سِحۡرٌ مُّسۡتَمِرٌّ﴾ (القمر: ١- ٢)

**"ڕۆژی قیامەت نزیک بووەتەوە و مانگیش لەت بوو، خۆ ئەگەر ئەوان هەر موعجیزە و بەڵگەیەک ببینن پشت هەڵدەکەن و دەڵێن ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە"**

***



# مۆرانه

تاریکیی شەو کۆڵانەکانی داپۆشیبوو. خەڵکی ناو بازاڕەکە بڵاوەیان لێکردبوو. لە سوچێکی کۆڵانەکەدا ژنێکی لاواز دانیشتبوو و

سەیری دەوروبەری دەکرد. کە زانی کەسی لێنەماوە، سەرپۆشەکەی دایەوە بە سەر دەموچاویدا. جارێکی تر سەیرێکی چواردەوری خۆی کرد. کاتێك زانی کەس دیار نییە، بەخێرایی هەنگاوی نا و خۆی هەڵدایە ئەو دووکانەوە کە پەنجەرەکەی داخرابوو. کە ڕۆیشتە ژوورەوە، جارێکی تر گەڕایەوە و دووبارە سەیری دەرەوەی کردەوە. هەناسە بڕکێی بوو. فرۆشیارە بەتەمەنەکە بە هێواشی وتی:

- کەس نەیبینیت، وانییە؟

ئەویش بەسەر ڕاوەشاندنەوە وتی:

- نەخێر.

ئەو ژنەی کە لەبەر برسێتی و تونیەتی زمانی وشك بووبوو، بە ئاسانی دەنگی دەرنەدەهات. فرۆشیارەکە وتی:

- دەزانم بە تەواوی زۆریان بۆ هێناون. هەموو شتێك دەکەن بۆ ئەوەی لەناوتان بەرن.

ژنەکە بە چاوێکی پڕ ترسەوە بوخچەکەی خستە سەر سنگی و ئەوەی وەریگرتبوو بە لەچکەکەی شاردبوویەوە و، وتی:

- گەمارۆکە هەر بەردەوامە، منداڵەکانمان بەرگەی برسێتی ناگرن و خەریکە دەمرن.

فرۆشیارەکە:

- بە پشتیوانی خوا بەم زووانە کۆتایی دێت.

ژنەکە زۆر پەلەی بوو، بۆیە وتی:

- دەبێت خێرا لێرە بڕۆم. چونکە موسوڵمانەکان چاوەڕێی منن.

فرۆشیارە بەساڵاچووەکە وتی:

- ئاگاداربە نەتبینن کە لێرە دەچیتە دەرەوە. ئەگینا دوکانەکەم بەسەردا دەڕوخێنن!

خاوەن دوکانەکە باوەڕی هێنابوو بە خوای گەورە، بەڵام باوەڕەکەی شاردبووەوە. یارمەتی موسوڵمانەکانیشی دەدا کە لە بارودۆخێکی زۆر دژواردا بوون.

ژنە پیرەکە لە ناخەوە پێی وت:

- دەزانم، خوا لێت ڕازی بێت.

مامەپیرە بە دەم فرمێسکەوە وتی:

- بەیانی زوو وەرە، خواردنتان بۆ ئامادە دەکەم.

ژنەکە پێش ئەوەی بڕواتە دەرەوە، جارێکی تر تەماشای دەرەوەی کرد و بە بێدەنگی ڕۆیشتە دەرەوە. بەناو شەقامەکانی مەککەدا ڕۆیشت. قاچی دەلەرزی، هەموو ساتێك لەوە دەترسا کە یەکێك بێتە سەر ڕێگەی. کە لە پاڵ کەعبەوە تێپەڕی، بینی وا پەڕەیەك بە دەرگاکەیەوە هەڵواسراوە. ئەو پەڕەیە چەند هەفتەیەك لەمەوبەر هەڵواسرابوو. بێباوەڕان کە زانیبوویان ناتوانن ببنە ڕێگر لەبەردەم ئاینی ئیسلامدا، لەناو خۆیاندا ڕێککەوتبوون. دوای کۆبوونەوەی هەموویان

پێکەوە، بڕیاریاندا گەمارۆ بخەنە سەر موسوڵمانان. واتە کڕین و فرۆشتن لەگەڵ موسوڵمانەکاندا نەکەن. تەنانەت ژن و ژنخوازیشیان لەگەڵدا نەکەن. سزای ئەوانەشیان دەدا کە یارمەتی موسوڵمانەکانیان دەدا.

موسوڵمانەکانیان لە دۆڵێکی دەرەوەی مەککەدا کۆکردبووەوە، خواردن و خواردنەوەیان نەدەنارد بۆیان. لە کۆتاییدا ڕۆژێکیان ئەبوتالیبی بەساڵاچوو هاتە مەککە. کاتێك بێباوەڕان ئەمەیان بینی، خێرا هەواڵیاندا بە ئەبوجەهل. ئەبوجەهل و هاوەڵەکانی زۆر دڵیان بەمە خۆش بوو. وا بیریان دەکردەوە کە موسوڵمانەکان دەگەڕێنەوە سەر بتپەرستی.

دەوروبەر تا بڵێیت فێنك بوو. چەندەها جۆر میوە لە بەردەم خەڵکەکەدا دانرابوو. یەکێ بە پێوە و یەکێکی تر بە دانیشتنەوە گوێیان بۆ ئەبوتالیب گرتبوو:

- برازاکەم هەواڵی بۆتان ناردووە. خوای گەورە مێروویەکی ناردووە بۆ ئەو پەڕەیەی کە بڕیاری گەمارۆکەتان تێدا نووسیوە و بە دەرگای کەعبەدا هەڵتان واسیوە. ئەم مێرووە هەموو ئەو بڕیارانەی کە نووسیوتانە خواردوویەتی، جگە لە یەك وشە، کە ئەویش ناوی خوای گەورەیە.

ئەوانەی لەوێ ئامادە بوون چاویان ئەبڵەق بوو بە هەواڵەکە. لە شوێنی خۆیان ڕاچڵەکین و هەستانە سەرپێ. ئینجا ئەبوتالیب پێی وتن:

- ئەگەر ئەوەی برازاکەم وتویەتی ڕاست بێت، ئەوا دەبێت کۆتایی بەم کارە خراپەتان بهێنن. خۆ ئەگەر پەڕەکە هیچی لێنەهاتبوو، ئەوا من ئەو ڕادەستی ئێوە دەکەم. جا سەربەستن لەوەی دەیکوژن یان بە زیندوویی دەیهێڵنەوە.

لە کۆڵانەکانی مەککەدا بوو بەڕاکردن، کۆمەڵێ لە بێباوەڕان بەپەلە بەرەو ئاڕاستەی کەعبە ڕۆیشتن. ئەوانەی دەهاتنە سەر ڕێیان، پاڵیان پێوە دەنان و ڕێگایان بۆ خۆیان دەکردەوە. تەنها یەك پرسیار لە مێشکیاندا هەبوو: تۆ بڵێی قسەکەی ئەبوتاڵیب ڕاست بێ؟

هەر کە ئەبوجەهل لە دەرگای کەعبە نزیك بووەوە، یەکسەر توشی پەشۆکان هات. ئەوانی تریش بە چاوی خۆیان بینیان کە پەڕەکە لە لایەن مۆرانەوە، کە جۆرە مێروویەکە، خوراوە. یەکێك لەناویاندا دەستی برد بۆ پەڕەکە و لێیکردەوە. بەڵی، هەر بەڕاستی هەموو پەڕەکە خورابوو! جگە لە "الله" هیچی تری لێ نەمابووەوە. جا لە پاش ئەوەی هەموویان ئەم موعجیزەیەیان بە چاوی خۆیان بینی، بۆ ئەوەی کەس ئیمان نەهێنێت، یەکسەر هەڵیان دایە و، وتیان:

- ئەمەش جادووە!

ئیدی ئەم ڕووداوە پڕ موعجیزەیە بووە مایەی کۆتایی هێنان بە گەمارۆی سەر موسوڵمانەکان کە سێ ساڵی ڕەبەقی خایاند. سەرەڕای پێداگریی هەندێ لە بێباوەڕان لەسەر بەردەوام بوونی گەمارۆکە، بەڵام ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە و ڕێکنەکەوتنەوە. بەم شێوەیە موسوڵمانەکان لەو ئازار و ئەشکەنجەیە ڕزگاریان بوو.

حەزرەتی خەدیجە لە سالانی ئابلۆقەکەدا هەموو سەروەتەکەی بۆ خزمەتی موسولمانان خەرج کرد. هەروەکو سامانەکەی، تەندروستیشی نەما. هەر بەو هۆیەشەوە مالئاوایی لە دونیا کرد. سێ رۆژ پێش ئەوەش، مامە بەوەفاکەی پێغەمبەرمان ﷺ کۆچی دوایی کردبوو. ئیدی پێغەمبەری سەروەرمان کە ئەو هەموو رووداوە دلتەزێنە یەك بەدوا یەکانەی بەسەردا هات. ئەو سالەی ناو نا "سالی پەژارە".

* * *



# میعراج

لەو کاتەدا کە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ لە شوێنێکی نزیك کەعبەدا کە ناوی "الحطیم" بوو، پشووی دەدا، جوبرەئیل هات بۆ لای. بەدیهێنراوێکی وەك وڵاخیشی لەگەڵدا بوو کە ناوی "بوراق" بوو. سەروەرمان ﷺ سواری بوراق بوو. دواتر بەیەکەوە کەوتنە ڕێ. بوراق بەدیهێنراوێکی زۆر ناوازە بوو. هەنگاوەکانی هێندە گەورە بوون، ئاسۆی بەیەك باز دەبڕی. لە کۆتاییدا گەیشتنە قودس. پێغەمبەر ﷺ

لەوێ لە بوراق دابەزی. لە "مزگەوتی ئەقصا" هەموو پێغەمبەران چاوەڕێیان دەکرد. سەرداری پێغەمبەران چووە پێشیانەوە و بوو بە ئیمامیان، هەموویان پێکەوە نوێژیان کرد. دوای نوێژەکە، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ جوبرەئیل بەرزبووەوە بۆ ئاسمان. کاتێك گەیشتنە "سیدرەتول مونتەها"، جوبرەئیل وەستا. پێغەمبەریش ﷺ بەسەرسوورمانەوە تەماشای کرد. حەزرەتی جوبرەئیل فەرمووی:

- ئەگەر من لێرەوە یەك هەنگاوی تر بنێم، دەسووتێم و دەبمە خۆڵەمێش.

پێغەمبەر ﷺ لەوێ بەدواوە بەتەنها کەوتە ڕێ. زۆری پێنەچوو پێغەمبەری سەروەرمان چووە حزووری پەروەردگاری مەزن. لەگەڵیدا گفتوگۆی کرد. لەگەڵ مەلائیکەتەکاندا بە بەهەشتدا گەڕا. ئەو جوانی و خۆشییانەی بەهەشتی بینی کە هەرگیز ژیری و خەیاڵی مرۆڤ دەرکی پێناکات. حۆری و مەلائیکەتەکان تکای زۆریان لێکرد کە لەوێ بمێنێتەوە. بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ بیری لە ئوممەتەکەی دەکردەوە. پێنج کاتەکەی نوێژ لەو شەوەدا فەرزکرا. لەپاش هەموو ئەمانە، بە هەمان ڕێگادا گەڕایەوە بۆ مەککە. بۆ بەیانییەکەی ڕۆیشتە لای قوڕەیشییەکان. یەك بە یەکی بەسەرهاتەکانی شەوی ڕابردووی بۆ باسکردن. هەموویان واقیان وڕمابوو. یەکێك لەناویاندا وتی:

- کەس ڕووداوی وای نەبیستووە. ئایا هیچ بەڵگەیەکت هەیە بۆ سەلماندنی قسەکانت؟

له بەرامبەر ئەمەدا، پێغەمبەری نازدارمان بە شێوازە نەرم و نیانەکەی خۆیەوە کەوتە باسکردنی بەڵگەکانی:

- له ڕێگادا گەیشتم بە کاروانێك کە بەرەو ئێرە دەهات. لە پێشی کاروانەکەشەوە وشترێکی مەیلەوڕەش دەڕۆیشت. دوو توورەکەش لەسەر پشتی وشترەکە بوو. یەکێکیان ڕەش و ئەوی تریشیان سپی بوو.
بێباوەڕان نەیاندەزانی بڵێن چی. پێغەمبەر ﷺ بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی:

- کاروانێکی تریشم بینی، ئەوان نوستبوون. گۆزەیەکی سەر داپۆشراویان پێبوو، ئاوەکەی ناویم خواردەوەوە و دووبارە سەرەکەیم داپۆشییەوە.

قوڕەیشییەکان بەبێ هیچ نقە و جووڵەیەك گوێیان بۆ قسەکانی پێغەمبەر ﷺ گرتبوو. هەموویان لە جۆش و خرۆشێکی زۆردا بوون.
پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیەکی تریشی پێوتن:

- له ڕێگادا بە چەند پیاوێك گەیشتم. بەدوای وشترە ونبووەکەیاندا دەگەڕان. شوێنی وشترەکەیانم پێوتن تا بڕۆن و بیدۆزنەوە. ئیتر دوای ئەوە بەرەو شام ڕۆشتم.

بێباوەڕان بۆ چەند ساتێك کەوتنە بیرکردنەوە. نەیاندەزانی باوەڕ بەم ڕووداوە نائاساییە بکەن یان نا. هەموویان دەیانزانی کەسێك کە لە ژیانیدا بە گاڵتەشەوە درۆی لە دەم دەرنەهاتبێ، بێگومان لە بابەتێکی

ئاوەها گرنگدا درۆ ناکات. یەکێکیان هەستایە سەر پێ، چاوی بڕییە چاوی ئەوانی تر و، وتی:

- موحەممەد تا ئێستا تەنها درۆیەکیشی نەکردووە. بەڵام با لە ڕاستیی ئەم قسانەی بکۆڵینەوە. با هەر ئێستا بکەوینە ڕێ، لەگەڵ ئەو کەسانەی بینیونی، قسەبکەین و ڕاست و دروستیی قسەکانی ساغ بکەینەوە.

لەگەڵ ئەم قسەیەدا بەرەو دەروازەی شار کەوتنە ڕێ. دوای ماوەیەکی زۆر، یەکێك لەو کاروانانەی کە پێغەمبەر ﷺ باسی کردبوو، گەیشت. بێباوەڕان بە تاسەوە بەرەو ڕووی چوون. کاتێك نزیك بوونەوە زۆر سەرسام بوون بەوەی کە بینییان. بە چپە سەرسووڕمانی خۆیان بۆ یەکتری دەردەبڕی.

- بەڵام شتی وا چۆن دەبێت؟ وشترەکەی پێشەوە هەروەك بۆی باسکردین، ڕەشباوە!

- جگە لەوە، تەماشای دوو توورەکەکەی سەر پشتی بکەن. یەکێکیان ڕەشە و ئەوی تریشیان سپی!

بۆیە وتیان:

- کەواتە... کەواتە موحەممەد ڕاستگۆ بوو لەگەڵمان.

بێباوەڕان سەریان شۆڕکرد و قسەیان نەما. نەیاندەتوانی تەنها یەك وشەش بڵێن. یەکێکیان بێدەنگییەکەی شکاند و، وتی:

- با چاوەڕێی کاروانەکەی تریش بکەین!

کەمێکی تر چاوەڕێیان کرد. لە کۆتاییدا لە ئاسۆوە ڕەشاییەك دەرکەوت. بەڵێ، ئەوە ئەو کاروانە بوو کە ئەمان چاوەڕێیان دەکرد. بە پەرۆشییەکی زۆرەوە بەرەو کاروانەکە ڕایانکرد. ئەوانەی لە کاروانەکەدا بوون هەستیان بە شڵەژاویی قوڕەیشییەکان کرد. بۆیە لێیان پرسین:

- چی بووە؟ بۆچی ئەوەندە شڵەژاون؟

پیاوەکان بە هەناسەبڕکێوە وەڵامیاندایەوە:

- کوا گۆزەی ئاو خواردنەوەکەتان؟

کاروانچیەکان هیچ تێنەدەگەیشتن. بەڵام هەرچۆنێك بێت یەکێکیان وەڵامی دانەوە و، وتی:

- ئەوەتا لێرەیە!

- ئایا لە ڕێگادا هیچ شتێکی سەرنجڕاکێش بەسەر ئەم گۆزەیەدا هاتووە؟

- بەڵێ!

- چی ڕوویدا؟

- کاتێك خەوتین گۆزەکە پڕبوو لە ئاو و سەریشی داپۆشرابوو. کە بەخەبەر هاتین، دەبینین دڵۆپێك ئاوی تێدا نەماوە. پەڕۆکەی سەریشی چۆن بەستبوومان و پێمان داپۆشی بوو، ئاوەها وەك خۆی بەسترابووەوە.

قوڕەیشییەکان لە بەرامبەر ئەم قسانەدا کەوتنە سەر چۆك. کاروانچییەکانیش بە سەرسووڕمانەوە تەماشایان دەکردن. هەوڵیان دەدا تێبگەن و بزانن چی ڕوویداوە. بەڵام قوڕەیشییەکان لە حاڵێکی وەهادا نەبوون کە بتوانن قسە بکەن. لە کۆتاییدا یەکێکیان دەستی بەقسە کرد و، وتی:

- هاوڕێیان! با لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو وشترەش بکەین کە ون بووە. با یەکێکمان بڕوات ئەو پیاوانە بدۆزێتەوە و پرسیاریان لێبکات دەربارەی ئەو ڕووداوە.

خێرا یەکێکیان سواری ئەسپەکەی بوو و کەوتەڕێ. بەڵام زۆر بە دڵگرانی گەڕایەوە. قوڕەیشییەکان بە ڕوخساریدا تێگەیشتن کە ئەو ڕووداوەش وەکو ئەوانەی پێشوو ڕاست بووە. پیاوەکە بە سەرشۆڕییەوە وتی:

- خاوەنی وشترەکەم دۆزییەوە. موحەممەد ڕاستییەکەی بە ئێمە وتووە.

قوڕەیشییەکان لە بەرامبەر هەموو ئەم شتانەدا زۆر بە ڕەشبینیی بیریان دەکردەوە. کەللە ڕەقییەکەیان ڕێگر بوو لەبەردەمیان. بۆیە یەکێکیان ڕووی کردە پێغەمبەری خوا ﷺ و، وتی:

- باشە بزانم دەتوانی وەسفی مزگەوتی ئەقصامان بۆ بکەی؟

پێغەمبەر ﷺ بە بێ هیچ دوودڵییەك هەرچی شەو بینیبووی، بۆی گێڕانەوە. کاتێك پێغەمبەر ﷺ وەسفی مزگەوتەکەی دەکرد، ئەو

کەسەی پرسیارەکەی لێکردبوو، زوو زوو ڕەنگی دەگۆڕا. ئەوانی تریش بە حاڵی کابرادا تێگەیشتن کە ئەو شتانەی پێغەمبەر ﷺ دەیانڵێت ڕاستن. لە پڕێکدا کابرا قسەی بە پێغەمبەری خوا بڕی و، وتی:

- مادام وایە، مزگەوتی ئەقصا چەند دەرگای هەیە؟

پێغەمبەری ئازیزمان زۆر بێتاقەت بوو. سەرەڕای ئەو هەموو بەڵگە و سەلماندنانە، کەچی هێشتا قوڕەیشییەکان نیازیان نەبوو باوەڕی پێ بهێنن. لە دوای پرسیارەکە پێغەمبەری خوا ﷺ کەمێك وەستا. چونکە دەرگاکانی مزگەوتی ئەقصای نەژماردبوو. بەڵام لەو کاتەدا موعجیزەیەك ڕوویدا کە تەنها چاوی پێغەمبەر ﷺ دەیبینی. خوای گەورە مزگەوتی ئەقصای بە هەموو جوانییەکەیەوە هێنایە پێشچاوی پێغەمبەری خودا ﷺ. فەخری کائینات بە ئاسانی دەرگاکانی ژمارد و وەڵامی بێباوەڕەکانی دایەوە.

بەم وەڵامەشەوە نەوەستا، بەڵکو کۆمەڵێك نیشانەی تری مزگەوتی ئەقصای پێوتن کە ئەوانیش نەیاندەزانی. ئیتر بەمجۆرە بێباوەڕان هیچیان بەدەستەوە نەما و، وتیان:

- تەواو! وشە بە وشەی قسەکانت ڕاست بوو.

بەڵام هەر موسوڵمان نەبوون. بگرە بیریشییان دەکردەوە کە چۆن ئەو ڕووداوانە لەدژی موسوڵمانەکان بەکاربهێنن. هەندێکیان بە خێرایی نزیکترین هاوڕێی پێغەمبەر، حەزرەتی ئەبوبەکریان دۆزییەوە و، پێیان وت:

- ئایا بیستووتە هاوەڵەکەت دەڵێت ئەمشەو ڕۆیشتووم بۆ مزگەوتی ئەقصا؟ گوایە لەوێ نوێژی کردووە و هەر ئەو شەوەش گەڕاوەتەوە!

حەزرەتی ئەبوبەکر بە بیستنی ئەم قسانە هیچ نیشانەیەکی سەرسامی بە ڕوخساریەوە دەرنەکەوت، بە لەسەرخۆییەکەوە پرسی:

- ئایا ئەو خۆی ئەم شتانەی پێ وتن؟

بە زەردەخەنەیەکی گاڵتە ئامێزەوە سەریان ڕاوەشاند و، وتیان:

- بەڵێ! ئەو وا دەڵێ. شتێکی سەیرە، وانییە؟

- نەخێر، ئەگەر ئەو وتبێتی، وەڵڵاهی ڕاست دەکات. ئێوە بەچی سەرتان سووڕماوە؟ من باوەڕم بەوە هەیە کە لە ئاسمانەکانەوە وەحی بۆ دێت. ئێستا تۆ بڵێیت باوەڕ بەمە نەکەم؟!

بێباوەڕان دەمیان بوو بە تەڵەی تەقیو، نەیاندەزانی لەبەردەم حەزرەتی ئەبوبەکردا چی بڵێن. کشانە دواوە و لەبەر چاوان ونبوون.

وەك بڵێی خوای گەورە بە موعجیزەی "میعراج" دڵی پێغەمبەری نازداری دابێتەوە، کە تازە دوو کەسی خۆشەویستی لەدەست دابوو. دەتوت خوای گەورە لە ڕێی ئەم ڕووداوەوە بە پێغەمبەری ئازیزمان دەفەرموێت:

" ئەی موحەممەد، دڵگران مەبە! منت لەپشتم."

***



# كۆچ

کاتی نیوەڕۆ بوو. مەککە بەدەم ڕۆژێکی نوێوە خەبەری بووەوە. بەڵام زۆرێك لە موسوڵمانەکان یەك یەك و دوو دوو کۆچیانکردبوو بۆ یەثریب، کە دوای کۆچی پێغەمبەری ئازیزمان بۆ ئەو شارە، ناونرا "مەدینەی مونەووەرە". کاتێك موشریکەکان بەمەیان زانی، سزا و ئەشکەنجەی

موسوڵمانەکانیان توندتر کرد. بەڵام وێڕای هەموو ئەمانە، جگە لە پێغەمبەر و حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عەلی و چەند موسوڵمانێکی کەم، کەس نەمابوو کۆچ نەکات بۆ مەدینە.

ئەو دوو کەسەی کە هاتنە کۆڵانەکەوە، ڕاستەوخۆ بەرەو نانەواخانەکە ڕۆیشتن. بۆنی نانی تازە بەچواردەوردا بڵا بوویۆوە. شنەبایەکی هێمنیش بۆنەکەی بەناو کۆڵانەکاندا بڵاودەکردەوە. هەندێك کەس بەم بۆنە هەستیان بە برسێتی کرد و زانییان کە وەختی نیوەڕۆیە.

ئەو کۆڵانەی دەکەوتە پشتی بازاڕەکە، چۆڵ بوو. پاش کەمێك پێغەمبەر ﷺ بەوێدا تێپەڕی. ئەمە شتێکی نائاسایی بوو. سەروەرمان بەو گەرمایە بۆ سەردانی ئەبوبەکر دەڕۆیشت. لە کاتی ئاساییدا پێغەمبەری خواﷺ ئەو سەردانانەی لە بەیانیان یان ئێواراندا ئەنجام دەدا. بەڵام وا دیار بوو ئەمڕۆ بابەتێکی زۆر گرنگ لە ئارادا بوو، وا پێغەمبەری خوای ﷺ بەو قرچەی گەرمایە هێنابووە دەر.

پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەرگای دا، حەزرەتی ئەبوبەکریان ئاگادار کردەوە لەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفیان هێناوە.

حەزرەتی ئەبوبەکر بەخێرایی لە جێگاکەی هەستایەوە. زۆر سەری سووڕمابوو لەوەی کە چۆن پێغەمبەری خوا لەم کاتەدا تەشریفیان هێناوە. بۆیە وتی:

- وەڵڵاهی هەرگیز پێغەمبەر ﷺ لەم کاتانەدا نەدەهات. بە دڵنیاییەوە کارێکی گرنگی هەیە وا هاتووە.

پاشان ڕۆیشت بەرەو پیری پێغەمبەر ﷺ و، وتی:

- یاخوا بەخێربێیت، خێرە ئینشائەڵڵا!

پێغەمبەر ﷺ پێی ڕاگەیاند کە خوای گەورە مۆڵەتی کۆچکردنی پێداوە.

لە بەرامبەر ئەمەدا حەزرەتی ئەبوبەکر دووبارە پەشۆکان ڕووی تێکردەوە. پرسیارێك لە مێشکیدا هەر دەهات و دەچوو و زۆر بە پەرۆش بوو بۆ زانینی وەڵامەکەی. بۆیە پرسی:

- دایك و باوکم بەقوربانت بێت ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا منت لەگەڵدا دەبەی؟

هەر کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی "بەڵێ"، حەزرەتی ئەبوبەکر لە خۆشیدا دەستی کرد بە گریان.

بەیەکەوە دانیشتن و نەخشەی کۆچەکەیان کێشا. لەگەڵ "ئورەیقیت"یشدا ڕێککەوتن تاکو ببێتە چاوساغی ڕێ. ڕێپیشاندەرەکە لە پاش سێ شەو بەخۆی و سێ وشترەوە لە شوێنی دیاریکراودا چاوەڕێی دەکردن. لەپاش تەواوکردنی گشت پێداویستییەکانی کۆچ، پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە ماڵەوە. ئەو ئێوارەیەی کە بەرێدەکەوتن، پێغەمبەر ﷺ حەزرەتی عەلی بانگکردە لای خۆیی و، پێی فەرموو:

- ئەمشەو تۆ لە جێگاکەی مندا بخەوە. ئەم جبەیەش جوان بدە بە خۆتدا. دڵنیابە، بێباوەڕان ناتوانن ئازارت پێبگەیەنن.

ئەو شەوە حەزرەتی عەلی -خوای لێ ڕازی بێت- لە جێگاکەی پێغەمبەردا نوست. لە دەمی بەرەبەیاندا پێغەمبەری خوا ﷺ سورەتی یاسینی خوێند و بەناو ئەو موشریکانەدا ڕۆیشت کە هاتبوون بۆ کوشتنی.

بەیانییەکی زۆر فێنك بوو، کەس بەدەرەوە نەبوو. ئەستێرەکان بە ئاسمانەوە دەبریسکانەوە. نزیکی بەرەبەیان بوو. دوو کەس بەناو کۆڵانەکاندا دەڕۆیشتن. بێ ئەوەی کەس بیانبینێت، گەیشتنە بیبانەکە. حەزرەتی ئەبوبەکر-خوای لێ ڕازی بێت- لە دڵەڕاوکێدا بوو. بەردەوام تەماشای ڕاست و چەپی خۆی دەکرد و لە خەمی ئەوەدا بوو کە کەسێك دوایان کەوتبێت. کە دڵنیابوو لەوەی کەس دوایان نەکەوتووە، ڕۆیشتە پێش پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ ئەوەی لە هەر مەترسییەك بیپارێزێت کە لە پێشەوە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە.

فەخری کائینات ﷺ کە ئەم هەڵسوکەوتانەی حەزرەتی ئەبوبەکری بینی، پرسی:

- ئەی ئەبوبەکر! بۆ دەمێك لە پشتمەوە و دەمێکیش لە پێشمەوە دەڕۆیت؟

- کاتێك لە پشتتەوە دەڕۆم، لە ترسی ئەوەیە کە نەبادا لە پشتەوە مەترسییەك هەبێت و زیانت پێبگەیەنێت، بەڵام هەر کە بە بیرما دێت

کە ئەگەری ئەوە هەیە لە پێشەوە ڕووبەڕووی مەترسی ببیتەوە، یەکسەر دێمە پێشەوە. ئیدی بەمجۆرە...

لە بەرامبەر ئەمەدا پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵە ڕاستگۆ و دڵسۆزەکەی فەرموو:

- ئەی ئەبوبەکر! دەتەوێت ئەو بەڵایەی کە بۆ من دێت، بەسەر تۆدا بێت؟

ئەبوبەکر:

-بەڵێ! سوێند بەو خوایەی کە تۆی بە دینێکی ڕاستەوە وەك پێغەمبەر ناردووە، دەمەوێت ئەو بەڵایانەی بۆ تۆ دێن، بەسەر مندا بێن.

بەڵێ، حەزرەتی ئەبوبەکر بەو قسانەی، ڕاددەی خۆشەویستی خۆی بۆ پێغەمبەری خوا دەربڕی.

پاش کاتژمێرێك لەبەردەوام بوونیان لەگەشتەکەیان، گەیشتنە دامێنی چیای " ثور". کە گەیشتنە بەردەم ئەشکەوتەکە، حەزرەتی ئەبوبەکر لە پێشدا چووە ناو ئەشکەوتەکەوە و جوان پاکی کردەوە. دواتر بە جلەکانی بەری، کونەکانی ناو ئەشکەوتەکەی گرت. بەڵام کونێکی بچووك بە کراوەیی مایەوە. کە کارەکەی تەواوبوو، فەرمووی لە پێغەمبەری خوا کرد کە تەشریف بهێنێتە ژوورەوە.

پێغەمبەر ﷺ سەری موبارەکی خستە سەر ڕانی حەزرەتی ئەبوبەکر و نووست. لەو کاتەشدا حەزرەتی ئەبوبەکر بە پاژنە پێی ئەو

کونەی گرتبوو کە بە پڕنەکراوەیی مابووەوە. زۆری نەخایاند هەستی بە ئازارێکی زۆرکرد لە پاژنە پێیدا. مەگەر مار پێوەی دابوو! جا وەرە بڕوانە ئەو خۆشەویستی و قوربانیدانە! بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ خەبەری نەبێتەوە، هەوڵی دەدا ئازارەکەی بشارێتەوە. بەڵام هێندە ئازاری پێگەیشتبوو، نەیدەتوانی ڕێگە لەو دڵۆپە ئارەقانە بگرێت کە لە نێوچاوانی دەچۆڕا. هەندێك لەو دڵۆپانە کەوتنە سەر ڕوومەتی پێغەمبەری خوا ﷺ. بۆیە پێغەمبەر ﷺ چاوی کردەوە و، پرسی:

- ئەی ئەبوبەکر، چی بووە؟

- پێغەمبەری خوا، مار قاچمی گەست. بەڵام گرنگ نییە.

ئینجا پێغەمبەرمان ﷺ لیکی موبارەکی دا لەو شوێنەی مارەکە گەستبووی، ڕاستەوخۆ ئازارەکەی نەما. بەمجۆرە ئەو دوو دۆستە ئازیزە لەو ئەشکەوتە تەنگەدا لە چاوەڕوانیدا مانەوە.

***

# کۆتر و جاڵجاڵۆکە

لە بیابانەکەدا کۆمەڵێك لە بێباوەڕان بە ڕق و تووڕەییەوە بەدوای پێغەمبەر و حەزرەتی ئەبوبەکردا دەگەڕان. لە پێشەوە "جێ پێ هەڵگرەکە" دەڕۆیشت، ڕێگەکەی پیشاندەدان. جێ پێکان وردە وردە تا دامێنی چیای ثەور بەردەوام بوو. ئەبوجەهل لە ئەسپەکەی دابەزی و ڕۆیشتە لای جێ پێ هەڵگرەوەکە و، وتی:

- دڵنیایت کە ئەوان لێرەن؟

جێ پێ هەڵگرەکە بەتەمەن و خاوەن ئەزموون بوو، بۆیە بە لەخۆڕازیبوونێکەوە وەڵامی دایەوە:

- دڵنیام، ئەوەتا جێ پێکان تا ئێرە دێن و دواتر نامێنن.

"سوراقه" که له دواوه‌وه به سواری ئه‌سپه‌که‌یه‌وه بوو، چاوێکی بڕییه لێژایی چیاکه و به دواشیدا ته‌ماشایه‌کی بیابانه بێ بنه‌که‌ی کرد و، وتی:

- که‌واته با بگه‌ڕێین!

له ڕاستیشدا جێ پێکان تا دامێنی چیاکه هاتبوون و دواتر نه‌مابوون. بێباوه‌ڕان هێدی هێدی له ئه‌شکه‌وته‌که نزیك ده‌بوونه‌وه. کاتێك حه‌زره‌تی ئه‌بوبه‌کر نزیك بوونه‌وه‌ی موشریکه‌کانی بینی، شڵه‌ژا و که‌وته دڵه‌ڕاوکێ. کاتێك سه‌رداری مرۆڤایه‌تی ﷺ حه‌زره‌تی ئه‌بوبه‌کری به‌و حاڵه‌وه بینی، دڵی دایه‌وه و، پێی فه‌رموو:

- دڵگران مه‌به! خوای گه‌وره‌مان له‌گه‌ڵدایه.

له‌ولاشه‌وه، بێباوه‌ڕان تا ده‌هات نزیکتر ده‌بوونه‌وه.

"جێ پێ هه‌ڵگره‌وه‌که" به ده‌ستی ئاماژه‌ی بۆ ئه‌شکه‌وته‌که کرد و، وتی:

- ئه‌وه‌تا شوێنه‌وارێك له‌سه‌ر ئه‌و به‌رده هه‌یه. سوێند بێت نه‌ڕۆیشتوونه‌ته ئه‌ولاتره‌وه.

بێباوه‌ڕان له‌سه‌ر ئه‌سپه‌کانیان دابه‌زین و شمشێره‌کانیان گرت به‌ده‌ستیانه‌وه. بۆ دڵنیابوون له جێ پێ هه‌ڵگره‌که‌یان پرسیه‌وه:

- تا ئێستا هه‌ڵه‌ت نه‌کردووه، وانییه؟!

جێ پێ هه‌ڵگره به‌ته‌مه‌نه‌که زۆر دڵنیا بوو، بۆیه وتی:



- بەدڵنیاییەوە هەڵەم نەکردووە.

یەکێکیان لە ئەشکەوتەکە نزیك بوویەوە. سەیرێکی ئەو ناوەی کرد و گەڕایەوە لایان. ئەبوجەهل وتی:

- چی بوو؟ بۆچی سەیری ناو ئەشکەوتەکەت نەکرد؟!

بە چاوێکی گوماناوییەوە سەیرێکی جێ پێ هەڵگرەکەی کرد و، وتی:

- پێویست بە سەیرکردن ناکات. هەرگیز ڕێی تێناچێت لەوێ بن!

ئەبوجەهل تووڕە بوو و، وتی:

- لەبەر چی؟

- چونکە جاڵجاڵۆکە دەرگای ئەشکەوتەکەی تەنیوە.

لەگەڵ بیستنی ئەم قسەیەدا، ئەبوجەهل و ئەوانەی چواردەوری چوونە بەردەم ئەشکەوتەکە. یەکێك لە ڕێپیشاندەرە لاوەکان وتی:

- ئەوەتا کۆترێکیش هێلانەی کردووە! ئەگەر یەکێك لە ژوورەوە بوایە، ئەوا بێگومان ئەو کۆترە لێرە نەدەبوو.

ئەبوجەهل گڕی دەکردەوە. بە تووڕەییەوە ڕوانییە جێ پێ هەڵگرە بەساڵاچووەکە و تێر سەرزەنشتی کرد. لەو کاتەدا یەکێکیان کە دەستی نابوو بە بەردی ئەوشکەوتەکەوە، وتی:

- با بڕۆینە ناو ئەشکەوتەکەوە و سەیرێکی بکەین.

ئومەییە بە توندی قۆڵی گرت و ڕایکێشا و کەوتە قسە پێوتنی:

- ئەرێ تۆ هیچ مێشکت هەیە؟ سەیرێکی ئەو داوی جاڵجاڵۆکەیە بکە. ئەو داوە پێش ئەوەی موحەممەد لەدایك بێت تەنراوە.

ئومەییە ئەمەی وت و کەوتە دابەزین لە شاخەکە.

لە کاتێکدا کە دەهاتنە خوارەوە، یەکێکیان وتی:

- ئەگەر تۆزێك پەلە بکەین لەوانەیە لەسەر بیرەکان بیانگرینەوە.

بەم قسەیە ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد کە پێویستە لە شوێنێکی تر بە دوایاندا بگەڕێن. ئەبوجەهل بە شپرزەیی لە دوایانەوە بوو. ئەوەی بەدوایدا دەگەڕان، نەیاندۆزییەوە، بۆیە سواری ئەسپەکانیان بوون و دورکەوتنەوە. لەم نێوەندەدا حەزرەتی ئەبوبەکر تا بڵێی لە ترس و دڵەڕاوکێدا بوو. چونکە کاتێك تۆزێ سەری بەرزکردەوە، قاچی بێباوەڕانی لێوە دیاربوو، بۆیە وتی:

- ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر یەکێکیان بنوشتێتەوە و سەیرێکی ئەشکەوتەکە بکات، ئەوا یەکسەر دەمانبینێت.

پێغەمبەری خواش ﷺ دڵنەوایی حەزرەتی ئەبوبەکری کرد و، وتی:

- ئارام بە ئەبوبەکر! ڕات چۆنە بەرامبەر دوو کەس کە سێهەمیان پەروەردەگاری مەزن بێت.

کاتێك موشریکەکان سواری ئەسپەکانیان بوون و دوورکەوتنەوە، جاڵجاڵۆکەکە هەر بەردەوام بوو لە تەنینی داوەکەی. کۆترەکەش لەسەر هێلکەکانی نیشتبوو بۆ ئەوەی هەڵیانبهێنێت. پەروەردگاری میهرەبان بە هۆی کۆترێك و داوی جاڵجاڵۆکەیەکەوە، پێغەمبەری ئازیزمان و حەزرەتی ئەبوبەکری پاراست.

***

# له مەدینە

ئەوانەی لە بەیانییەوە چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد کە میوانەکانیان لە بیابانەکەوە دەرکەون، ماندوو بووبوون. پلەی گەرماش زۆر بەرز بووبووەوە. بۆیە خەڵکەکە ژێر دارخورماکانیان جێهێشتبوو و گەڕابوونەوە ماڵەکانیان. ئەوانەشی چاودێری دەروازەکەیان دەکرد، بەنیاز بوون دەست هەڵبگرن و بڕۆن. ئا لەم کاتانەدا بوو کە لەپڕ یەکێك هاواری کرد:

- ئەوەتان بەرەو ئێرە دێن!

لە دوورەوە لەناو تراویلکەی بیابانەکەدا چەند کەسێکی جل سپی دەرکەوتن. هەر کە ئەم هەواڵە بڵاو بووەوە، وەك جەژنی لێهات و خەڵکی مەدینە بێ گوێدانە تیشکی بەهێزی خۆر، ڕۆیشتنە دەرەوە بۆ پێشوازیی پێغەمبەرﷺ. ئەوانەی کە دەڕۆیشتن بۆ بەخێرهاتنی

پێغەمبەر ﷺ، لەژێر دارخورمایەکدا کە لەوێ ئیسراحەتی دەکرد، پێی شاد دەبوون.

خەڵکەکە دڵیان زۆر خۆش بوو بەوەی کە چاویان بەو میوانە پیرۆزەیان دەکەوت. ئاخر چەندین ڕۆژە چاوەڕێی هاتنی دەکەن. پاشان پێغەمبەر ﷺ لە گوندێکی نزیك مەدینە کە ناوی "قوبا" بوو لایدا. لەوێ مزگەوتێك دروستکرا. پێغەمبەر ﷺ نزیکەی دە ڕۆژ لەوێ مایەوە و دواتر بەرەو مەدینە تەشریفی برد. کە میوانە پیرۆزەکە گەیشتە مەدینە، خەڵکەکە لە خۆشیدا نەیاندەزانی چی بکەن. پیاو و ژن و منداڵ ڕۆیشتبوونە سەر سەربانی ماڵەکانیان و ، دەیانوت:

- ئەی موحەممەد... ئەی پێغەمبەری خوا!

هەندێکیان بە دەف لێدانەوە خۆشی خۆیان دەردەبڕی و سروودی شادییان دەچڕی:

- مانگی تابان لێمان هەڵهات لە گردی "وەداع"وە، سوپاسکردنی خوای گەورە واجب بوو لەسەرمان.

پێغەمبەر ﷺ بەسەر وشترەکەیەوە بەناو ئەو دیمەنە جوانانەدا دەڕۆیشت. لەناو خەڵکەکەدا یەکێك لە وشترەکە نزیك بووەوە و بە خواستێکی زۆرەوە تکای لە ئازیزی دڵان ﷺ کرد، ببێتە میوانیان:

- ئەی پێغەمبەری خوا! بفەرموون بۆ ماڵی ئێمە.

زۆر کەس هەبوون کە دەیانویست میوانداریی پێغەمبەرﷺ بکەن. سەروەریشمان ﷺ نەیدەویست دڵی کەسیان بشکێنێت. جڵەوی وشترەکەی کە ناوی "قەسوە" بوو بەردا و، فەرمووی:

- ڕێی وشترەکە چۆڵ بکەن، چونکە فەرمانی پێدراوە لە کوێدا چۆك بدات.

خەڵکەکە ڕۆیشتنە داوەوە و ڕێگایان بۆ وشترەکە کردەوە. وشترەکەش بەهێواشی کەوتە ڕێ. هەموویان بە پەرۆشییەوە دوای وشترەکە کەوتبوون. قەسوە ڕۆیشتە شوێنێك و چۆکی دادا و کەوتە دەنگ دەرکردن.

پێغەمبەر ﷺ لەسەر وشترەکەی دابەزی و، فەرمووی:

- بە پشتیوانی خوا ئێرە شوێنمانە.

کات درەنگ بووبوو، دنیاش خەریك بوو تاریك دەبوو. مەدینەییەکانیش لەلای پێغەمبەری ئازیز دوور نەدەکەوتنەوە، دەیانویست بیبەنە ماڵی خۆیان و میوانداری بکەن.

پێغەمبەرﷺ بە خەڵکەکەی چواردەوری ڕاگەیاند کە ئەم شەو لەلای کوڕەکانی نەججار، کە لە خاڵەکانی عەبدولموتەڵیبن، دەمێنێتەوە. دواتر پرسی:

- نزیکترین خانوی خزمەکانمان هی کێیە؟

ئەبوئەیوبی ئەنصاری وتی :

- ماڵی ئێمەیە ئەی پێغەمبەری خوا. مۆڵەتم بدەن با شتومەکەکانی سەر وشترەکەتان بۆ هەڵبگرم.

بەڵام ئەوانەی لەوێ بوون دەیانویست پێغەمبەری خودا ڕازی نەبێت بەوە. بەڵام پێغەمبەری نازدار ﷺ ئەمەی بۆ ڕوونکردنەوە و، فەرمووی:

- پیاو لای وڵاخ و شتومەکەکانی دەمێنێتەوە.

ئیتر بەمجۆرە یەکلایی بووەوە کە پێغەمبەر ﷺ لای کێ دەمێنێتەوە...

پێغەمبەر ﷺ لەناو هەموو خۆشەویستەکانیدا تەشریفی بردە ماڵی ئەبوئەیوبی ئەنصاری.

* * *



# کاروانە بازرگانییەکە

سالّی دووهەمی کۆچی بوو. بێباوەڕانی مەککە کاروانێکی بازرگانی هەزار وشترییان ئامادە کردبوو. لە ڕێگەی ئەم کاروانەوە کەلوپەلەکانیان دەبردە شام و لەویّ دەیانفرۆشت. بەو پارەیەش کە قازانجیان دەکرد، سوپایەکی گەورەیان لیّ پێك دەهێنا بۆ لەناوبردنی

موسوڵمانەکان. مەبەستی سەرەکی کاروانەکە ئەمە بوو. تەنانەت چل پاسەوانیشیان ئامادە کردبوو بۆ پارێزگاری کردن لە کاروانەکە. زۆربەی شتومەکی کاروانەکە هی ئەو موسوڵمانانە بوو کە کۆچیان کردبوو بۆ مەدینە.

لەپاش تەواوبوونی بازرگانییەکەیان، کاروانەکە بە سەرۆکایەتی ئەبوسوفیان لە شامەوە گەڕایەوە. پێغەمبەر ﷺ لە مەبەست و نیازی بێباوەڕان ئاگادار بووەوە. لە پاش ئەم هەواڵە، موسوڵمانەکانیش سوپایەکیان ئامادە کرد. لە "بەدر" بە کاروانەکە دەگەیشتن. جا خۆ ئامانج ئەوە بوو کە پارەی شتومەکەکانی خۆیان لە بێباوەڕان وەربگرنەوە. لە یەکێك لە ڕۆژە گەرمەکانی مانگی هاویندا کەوتنەڕێ. ئەمە جگە لەوەی کە مانگی ڕەمەزان بوو و هاوەڵە بەڕێزەکان بەڕۆژوو بوون. جا لەبەر ئەوەی کە لە جەنگدا بوون، سەروەرمان ﷺ ڕۆژووەکەیی شکاند و فەرمانی دا کە هەمووان ڕۆژووەکانیان بشکێنن.

لە ڕێگادا موسوڵمانەکان بە نۆرە سواری وشترەکان دەبوون. ئاخر ژمارەی وشتەرەکانیان کەم بوو. کاتێك نۆرەی پێغەمبەری خوا تەواو بوو، لە وشترەکە هاتە خوارەوە. هاوەڵەکەی دڵی ئاسوودە نەدەبوو کە پێغەمبەر ﷺ بە پێ بڕوات، بۆیە وتی:

- ئەی پێغەمبەری خوا! جەنابتان بفەرموون سوار بن، ئێمە بە پێ دەڕۆین.

پێغەمبەر ﷺ بەمە ڕازی نەبوو، بۆیە فەرمووی:

- ئێوە لە من بەهێزتر نین تاکو بە پێ بڕۆن، ئەمە جگە لەوەی کە لە وەرگرتنی پاداشتیشدا، لە من موحتاجتر نین.

بەمجۆرە، پێشەوای مرۆڤایەتی هەر وەکو موسوڵمانەکانی تر بەپێ دەستی کرد بە ڕۆیشتن. پێش ئەوەی سوپای موسوڵمانان بگاتە بیرەکانی بەدر، ئەبوسوفیان بە هەواڵەکەی زانیبوو. بۆیە خێرا ئاراستەی کاروانەکەی بەرەو دەریای سوور گۆڕی، بەبێ ئەوەی بەلای بەدردا بڕوات گەیشتەوە مەککە. ئەو هەواڵدەرەی کە ئەبوسوفیان ناردبووی بۆ مەککە، بە هات و هاوارەوە خۆی کرد بە مەککەدا و، هاواری دەکرد:

- خەڵکی مەککە! ئەی هۆزی قورەیش! موسوڵمانەکان هێرشیان کردە سەر کاروانە بازرگانییەکەتان. هەر ئێستا فریا کەون.

لەبەرامبەر ئەمەدا بێباوەڕان بە نزیکەی هەزار سەربازەوە کەوتنە ڕێ. بێباوەڕان دواتر زانیان کە کاروانەکە ڕزگاری بووە. بەڵام ئەبوجەهل نەیهێشت کەس بگەڕێتەوە.

پێغەمبەر ﷺ بە نیازی ڕێگرتن لە کاروانەکە سوپای ئامادە کردبوو. نەیدەویست بجەنگێ. بەڵام وا ئێستا بێباوەڕان سوپایەکی گەورەیان ئامادە کردووە و هێرشیان بۆ دەهێنن. پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵەکانیدا کۆبووەوە. ڕاوێژی ئەوەی پێکردن کە لەگەڵ بێباوەڕاندا بجەنگن یان دوای کاروانەکە بکەون. بەڵام لە کۆتاییدا بڕیاری ڕاوێژەکە ئەوە بوو کە بجەنگن.

***

# چەند کەس

بڕیاری ئەوە درابوو کە ڕووبەڕووی بێباوەڕان ببنەوە و لەگەڵیاندا بجەنگن. سوپای موسوڵمانان شەوی هەینی گەیشتە نزیك بەدر. کافرەکانیش کە لە مەککەوە هاتبوون، لە نزیك بەدر مۆڵیان دابوو. پێغەمبەر ﷺ دەیویست ژمارەی بێباوەڕان بزانێت. لەبەر ئەوە حەزرەتی عەلی ناردە نزیکی بیری ئاوەکەوە. ئیتر ئەوانیش یەکێکیان لەو بێباوەڕانە گرت کە هاتبووە سەر بیرەکە و هێنایان بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ. پێغەمبەر فەرمووی:

- دەربارەی قورەیشییەکان زانیاریم بدەرێ.

- سوێند بێت لە دوورترین و بەرزترین شوێنی ئەو گردە لمییەوەن کە دەیبینیت.

پێغەمبەر خوا ﷺ:

- ژمارەیان چەندە؟

- زۆر زۆرن!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

- بە نزیکەیی ژمارەیان چەند دەبێت؟

- نازانم!

لە بەرامبەر ئەمەدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

- ڕۆژانە چەند وشتر سەردەبڕن؟

کابرا تۆزێك بیری کردەوە، ئینجا وتی:

- ڕۆژێك نۆ دانە سەردەبڕن و ڕۆژێکیش دە.

بە گوێرەی ئەو زانیارییانە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:

- ئەوان نزیکەی "نۆ سەد و پەنجا" بۆ "هەزار" کەس دەبن.

بەمجۆرە پێغەمبەر ﷺ ژمارەی بێباوەڕانی زانی. زانینی ژمارەی سوپای دوژمن بۆ ئەو ڕۆژە زۆر گرنگ بوو. بە گوێرەی ئەو زانیارییە جارێکی تر چاویان خشاندەوە بە ئامادەکارییەکاندا.

پێغەمبەر ﷺ خۆی و هاوەڵەکانی لەگەڵ سوپاکەدا بەرەو بیری ئاوەکان هاتن. بەجیا حەوزێکیان بۆ ئاوی خواردنەوەی خۆیان دروست کرد. بیرەکانی تریشیان پڕ کردەوە، بۆ ئەوەی بێباوەڕان ئاویان دەست

نەکەوێت. پێغەمبەر ﷺ سوپاکەی ئامادە کرد بۆ جەنگ. یەکە بە یەکەی ڕیزی جەنگاوەرەکانی پشکنی. دواتر بە سوپاکەی ڕاگەیاند:

- ڕیزەکانتان بەجێ مەهێڵن و لە شوێنی خۆتاندا بمێننەوە. هەتا من فەرمانتان پێ نەکەم، دەست مەکەن بە جەنگ. لە تیرەکانتاندا زیادەڕەوی مەکەن، تاکو دوژمن نزیك نەبێتەوە تیر مەهاوێژن. دواجار کە لەگەڵ دوژمن ڕووبەڕوو بوونەوە، شمشێرەکانتان بەکار بهێنن.

سوپای دوژمنیش ئامادەکارییەکانیان تەواو کرد و هاتن. یەکەمجار یەك یەك شەڕیانکرد. لەم شەڕانەدا حەزرەتی حەمزە و حەزرەتی عەلی —خوا لێیان ڕازی بێت- لە ماوەیەکی کەمدا بەرامبەرەکەیان دا بە زەویدا. دواتر یارمەتی حەزرەتی عوبەیدەیان دا بەڵام حەزرەتی عوبەیدە بریندار بوو، دواتریش بە هۆی برینەکەیەوە شەهید بوو. کاتێك بێباوەڕان سەربازەکانیان بینی کەوتنە سەر زەوی، ترسیان لێنیشت و ژاوەژاو کەوتە نێو ڕیزەکانیانەوە. دواتر دەستیان کرد بە هێرش کردن. ئیتر بەم شێوەیە جەنگ بە تەواوی دەستی پێ کرد.

لە پاش تێپەڕبوونی جەنگێکی خوێناوی و ترسناك، موسوڵمانەکان سەرکەوتن و دەستیان بەسەر چەندین دیل و دەستکەوتی جەنگدا گرت. لەناو دیلەکاندا یەکێك لە مامەکانی پێغەمبەریشی تێدا بوو. بۆ ئەوەی ڕانەکەن، دیلەکان دەستیان بە توندی بەسترابووەوە. ئەو شەوە پێغەمبەر ﷺ بەهۆی نرکە وناڵەی یەکێکەوە بە ئاگا هات و خەوی لێنەدەکەوتەوە. یەکێك لە هاوەڵە بەڕێزەکان کە ئەمەی بینی، لێی پرسی:

-ئەی پێغەمبەری خوا هۆی چیە خەوتان لێناکەوێت؟

- لەبەر نرکە و ناڵەی عەبباسی مامم خەوم لێناکەوێت.

کاتێك هاوەڵەکان زانییان پێغەمبەری خوداﷺ بەمە دڵتەنگە و خەوی لێناکەوێت، خێرا دەستی عەبباسی مامی پێغەمبەریان کردەوە. پێغەمبەری خوا کە زانی نرکە و ناڵەکە نەماوە، پرسی:

- بۆچی نرکە و ناڵەی مامم نابیستم؟

ئەوانیش وەڵامیان دایەوە و وتیان کە دەستیان کردووەتەوە.

لە بەرامبەر ئەمەدا پێغەمبەری خوا پێی فەرموون کە دەستی هەموو دیلەکان بکەنەوە.

ئیتر ئەو شەوە دیلەکان پاش کردنەوەی دەستیان بە ئاسوودەیی سەریان نایەوە. جا لەبەر ئەوەی تا ئەو کاتە دەربارەی دیلەکان وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ نەهاتبوو، بۆیە لەگەڵ هاوەڵەکانیدا ڕاوێژی کرد.

بڕیاری کۆبوونەوەکە بەم جۆرە بوو: دیلە دەوڵەمەندەکان لە بەرامبەر "فیدیە"دا ئازاد دەکران. ئەوانەش کە توانای فیدیە دانیان نەبوو، بەڵام خوێندەوار بوون، دەبوایە لە بەرامبەر ئازاد کردنیاندا دە موسوڵمان فێری خوێندنەوە و نووسین بکەن. ئەو دیلانەش کە خوێندەوارییان نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەژار بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ ئازادی کردن.

***

# گردی تیرهاوێژەکان

کافرانی مەککە دەیانویست تۆڵەی شکستی جەنگی بەدر بکەنەوە و ببنە ڕێگر لەبەردەم بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلامدا. لەبەر ئەوە، سوپایەکی سێ هەزار کەسییان کۆکردەوە. بێ ئەوەی کات بەفیڕۆ بدەن کەوتنە ڕێ.

لەم نێوەندەشدا پێغەمبەر ﷺ سوپایەکی هەزار جەنگاوەری بۆ بەرەنگاربوونەوەیان ئامادەکرد. بەڵام شوێنی جەنگەکە تا ئەو کاتە یەکلایی نەبووبووەوە.

هاوەڵە لاوەکان لەگەڵ ئەوەدا بوون کە لە دەرەوەی شار بەرامبەر دوژمن بوەستنەوە. بەڵام هاوەڵە بەئەزموون و دونیا دیدەکان لەگەڵ

ئەوەدا بوون کە پێویستە لەناو شاردا بمێننەوە. بەلای ئەوانەوە شەڕی بەرگریکردن ئەنجامێکی باشی دەبوو بۆ موسوڵمانان.

ئەوانەی دەیانوت با بەرگریکردن لە دەرەوەی شار بێت، زۆرینە بوون. بۆیە پێغەمبەر ﷺ بۆچوونی زۆرینەی پەسەند کرد. هەموویان بەیەکەوە بەڕێکەوتن و تا نزیك چیای ئوحود ڕۆیشتن. لەوێدا هەردوو سوپاکە ڕووبەڕووی یەکتری بوونەوە.

موشریکەکان زۆر باوەڕیان بەخۆیان هەبوو، چونکە ژمارەیان تا بڵێیت زۆر بوو. تەنانەت شتومەکی ڕابواردنی پاش بردنەوەی جەنگەکەشیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو.

پێغەمبەر ﷺ سوپاکەی بە جوانترین شێوە ڕێك خست. باشترین پەنجا سەربازی جیاکردەوە و کردنی بە تیمی تیرهاوێژەکان. "عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیر"یشی کردە سەرکردەیان. بڕیاریدا ئەوان بنێرێتە سەر تەپۆڵکەی "عەینەین". بەمجۆرە دیوی پشتەوە و بەرەی چەپی سوپاکەیان دەپاراست. لەلای دەستە ڕاستیشەوە تەپۆڵکە هەبوو. پێغەمبەر ﷺ حەزرەتی عەبدوڵڵای بانگکردە لای خۆی و، پێ فەرموو:

- بە تیرەکانتان ئێمە بپارێزن. نەهێڵن سوارچاکەکانی دوژمن لێمان نزیك ببنەوە. ئاگاتان لێبێت لە دواوەوە لێمان نەدەن. ئەگەر ئێمە سەرکەوین، یاخود سەرنەکەوین، ئێوە لە شوێنی خۆتان نەجوڵێن. ئاگادار بن دوژمن لەلای ئێوەوە لێمان نەدات!

عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیر سەربازێکی بەئەزموون بوو. بەشداری جەنگی بەدریشی کردبوو. دواتر پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتە بەردەم تیمی تیرهاوێژەکان و تەماشای یەکە بە یەکەیانی کرد. دواتر بە دەنگێك کە هەموویان گوێیان لێبوو ئامۆژگاری کردن:

- پشتەوەمان باش بپارێزن. تەنانەت ئەگەر مردنی ئێمەشتان بینی شوێنەکانتان چۆڵ مەکەن و مەیەن بۆ یارمەتیمان. خۆ ئەگەر ئێمەشتان بینی دەستکەوتی جەنگ کۆدەکەینەوە، ئەوا هەر مەیەن بۆلامان. تەنانەت ئەگەر بینیشتان وا دوژمنمان لەناو برد و تێکمان شکاندن، تاکو خۆمان هەواڵتان بۆ نەنێرین، مەیەنە خوارەوە و شوێنەکانتان بەجێمەهێڵن.

لە فەرمانەکە تێگەیشتن. تیمی تیرهاوێژەکان بە ورەیەکی بەرزەوە کەوتنە ڕێ. لە ماوەیەکی کەمدا گردی عەینەینیان کردە سەنگەری خۆیان.

جەنگ دەستی پێکرد. هەر لەسەرەتای جەنگەکەوە دەرکەوت پێغەمبەری خوا ﷺ چ نەخشەیەکی گورزوەشێنی کێشاوە. سەرکردەی بەناوبانگ خالیدی کوڕی وەلید، بە خۆی و سەربازەکانییەوە لە باڵی چەپی موسوڵمانەکانەوە هێرشیان دەکرد. بەڵام نەیتوانی بگاتە شوێنی مەبەست، چونکە تیرهاوێژەکانی سەر گردەکە زۆر لێزانانە تیریان دەهاویشت. لە شوێنی خۆیانەوە تیریان دەگرتە دوژمن و وەك چۆلەکە ڕاویان دەکردن.

خالید ناچار بوو بگەڕێتەوە دواوە. لەم کاتەدا سوپای موسوڵمانان گورزێکی باشیان لە سوپای بێباوەڕان وەشاند. خالید لەبەردەم ئەم دیمەنەدا خۆی پێنەدەگیرا، خەریك بوو دڵی شەقی دەبرد.

سوارییەکانی سەرلەنوێ کۆکردەوە و هەڵمەتێکی نوێیان برد، بەڵام ئەنجام وەك خۆی مایەوە. عەبدوڵڵا و هاوەڵەکانی بەربەستێکی سەخت بوون، ئەستەم بوو ببەزێنرێن.

بێباوەڕان دەستیان کرد بە هەڵاتن. هەرکەسەو لە خەمی ڕزگارکردنی گیانی خۆیدا بوو. کە خالید ئەمەی بینی، جارێکی تر بەختی خۆی تاقی کردەوە. هەموو بەیەکەوە هێرشێکی تریان کردەوە. بەڵام دووبارە بەر لەوەی دەستیان بگاتە سوپای ئیسلام، ناچاربوون پاشەکشە بکەن. گردی تیرهاوێژەکان لە بری تیر، مەرگی دەباراند بەسەریاندا. بەڵام خالید وازی نەدەهێنا. بۆیە لەگەڵ سەربازەکانیدا کەوتنە چاوەڕوانی قۆستنەوەی هەلێك.

ئیتر لەناو مەیدانی جەنگەکەدا دوژمن نەمابوو. هەموویان بەرەو مەککە هەڵدەهاتن. ئەوەندە ترسابوون، تەنانەت نەیاندەوێرا بیر لە هەڵگرتنەوەی ئاڵاکانیشیان بکەنەوە. موسوڵمانەکان سوپای دوژمنیان پەرتەوازە کردبوو. تەنانەت هەندێك لە موجاهیدە موسوڵمانەکان دەستیان کردبوو بە کۆکردنەوەی دەستکەوتی جەنگ. یەکێك لە تیرهاوێژەکان کە ئەمەی بینی، بە دڵخۆشییەوە هاواری کرد:

- ئێمە بردمانەوە. جەنگ تەواو بوو، براکانمان دەسکەوت کۆ دەکەنەوە. دەی با ئێمەش بڕۆین.

عەبدوڵڵا ڕاچڵەکی و بە گومانەوە تەماشایەکی ئەو لایەی کرد کە خالید خۆی تیادا مەڵاس دابوو. خالید و سەربازەکانی هێشتا لەوێ مابوون. عەبدوڵڵا خێرا بە هاوڕێکانی وت:

- ئاگادار بن، شتی وا نەکەن! لە شوێنی خۆتان نەجوڵێن، ئەی گوێتان لە فەرمانەکەی پێغەمبەری خوا نەبوو؟

بەڵام جەنگاوەرەکان لەتاو خۆشی سەرکەوتن، وەکو بڵێی ئاگایان لە خۆیان نەمابوو. بە ڕاکردنەوە لە دامێنی گردەکەوە هاتنە خوارەوە. عەبدوڵڵا هەر هاواری لێدەکردن و، دەیوت:

- مەڕۆن! شوێنەکانتان جێمەهێڵن، هێشتا جەنگ تەواو نەبووە!

ئەوانەی کە دابەزیبوونە خوارەوە، هەر گوێشیان لەو قسانە نەبوو. جگە لە چوار پێنج تیرهاوێژ، کەس لەسەر گردەکە نەمابووەوە. خالید بەمەی زانی و ئەم هەلەی قۆستەوە. چەند وەخت بوو چاوەڕێی ئەم ساتەی دەکرد! ئێستا کاتی هاتبوو. بۆیە ڕووی کردە سەربازەکانی و، هاواری کرد:

- هێرش!

لەیەك کاتدا هەموویان وەك تیر دەرپەڕین. لە ماوەیەکی کەمدا خۆیان گەیاندە گردی تیرهاوێژەکان، ئەو چەند هاوەڵە بەڕێزەیان شەهید کرد کە لەسەر گردەکە مابوون. دواتر هێرشیان کردە سەر سوپای ئیسلام. موسوڵمانەکان کە خەریکی ڕاونانی جەنگاوەرەکانی دوژمن بوون، کاتێك لە پشتەوە گوێیان لە هات و هاواری دوژمن بوو، لە شوێنی خۆیان وەستان و جووڵەیان لێبڕا.

خالید و سەربازەکانی خۆیان کرد بەناو سوپای ئیسلامدا. ئەو تیرهاوێژانەی کە خەریکی دەستکەوت کۆکردنەوە بوون، سەریان سوورمابوو. ئەی هاوار ئێمە خەریکی چین؟! لەو کاتەدا تێگەشتن کە چ هەڵەیەکی گەورەیان کردووە. بەڵام تازە کار لە کار ترازا بوو. ئەو بێباوەڕانەی لە ترسا ڕایاندەکرد، هەرکە هەستیان بە هێرشەکەی خالید کرد، گەڕانەوە. یەکێکیان ئەو ئاڵایەی هەڵگرتەوە کە کەوتبووە سەر زەویی و دووبارە دەستیان کردەوە بە شەڕکردن.

موسوڵمانەکان کەوتبوونە نێوان دوو ئاگرەوە. خێرا لە چواردەوری پێغەمبەری خوا ﷺ کۆبوونەوە. پێغەمبەریان بە گیانی خۆیان دەپاراست. بە بەردێك ددانی پیرۆزی پێغەمبەرمان شکا. کە هاوەڵەکانی ئەمەیان بینی، بە چواردەوری پێغەمبەردا ڕیز بوون و بە جەستەی خۆیان دیوارێکیان بە دەوریدا دروست کرد و پاراستیان. حەفتا هاوەڵی پێغەمبەر لەم جەنگەدا شەهید بوون. مامە ئازیزەکەی پێغەمبەری خوا "حەزرەتی حەمزە"ش یەکێك بوو لەو شەهیدانە.

موسوڵمانەکان پەنایان بۆ گردێك برد و کافرەکانیش لەوە زیاتر لێیان نزیك نەبوونەوە. دەترسان لەوەی ئەو سەرکەوتنەی کە بە دەستیان هێناوە، بە دۆڕان بشکێتەوە بە سەریاندا. بێباوەڕان بە دڵخۆشییەوە بەرەو مەککە دەگەڕانەوە. لە کاتێکدا کە خەریك بوو بیدۆڕێنن، بەڵام لە سایەی خالیددا سەرکەوتن. هەر بۆیە لە خۆشی ئەوەدا، دەیانخواردەوە و ڕایاندەبوارد. هەواڵدەرێك بە هەناسە بڕکێوە بەرەو لای ئەبوسوفیان و گەورە پیاوەکانی تر ڕایکرد و، وتی:

- گەورەم! موسوڵمانەکان خۆیان کۆکردووەتەوە و بەو سەربازانەی کە لەلای ڕاستەوە ماویانە، هێرش دەکەنە سەرمان. وا دیارە دەیانەوێت پێش ئەوەی بگەینەوە مەککە، بمانگرن و لەناومان بەرن.

ئەبوسوفیان بە سەرسامییەوە سەیری هەواڵدەرەکەی دەکرد. چونکە ئەوەی کە هەواڵدەرەکە دەیوت، شتێکی باوەڕپێنەکراو بوو. ئاخر چۆن دەکرێت موسوڵمانەکان خۆیان کۆکردبێتەوە و ئامادەی هێرش بن؟

کە زانییان هەواڵەکە ڕاستە، بێباوەڕان ترس کەوتە دڵیانەوە. ئەبوسوفیان بە دەنگێکی گومانावییەوە وتی:

- جارێك سەرکەوتین بەسەر موسوڵمانەکاندا، بەڵام ئایا دەتوانین بیکەین بە دوو جار؟! ئەوەیان نازانم. باشترین شت ئەوەیە ئێمە خێرا بەرەو مەککە بگەڕێینەوە. ئەگەر نا، ئەو سەرکەوتنەی بە دەستمان هێناوە، ناچار دەبین بیدەینەوە پێیان.

هەر واشیان کرد. لە زووترین کاتدا خۆیان ئامادە کرد و خۆیان گەیاندەوە مەککە. بەمجۆرە دووبارە موسوڵمانەکان بوون بە لایەنی براوە.

***



## تاشه بەردەکە

لە جەرگەی تاریکیدا سوارێك بەبێ وەستان غاری بە ئەسپەکەی دەدا. بەبێ وچان خۆی گەیاندە مەدینە. کاتێك گەیشتە ناو کۆڵانەکانی مەدینە، هەموو شتێك ئاسایی دەبینرا. ئەوانەی بازرگانییان دەکرد لە

بازاڕبوون، ئەوانەشی کشتوکاڵییان دەکرد، لە کێڵگەکانیاندا سەرگەرمی کارکردن بوون. ئەم هەواڵدەرەی کە لە هۆزی "هوززە"وە هاتبوو، بێ ڕاوەستان خۆی گەیاندە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و، وتی:

- قوڕەیشییەکانی مەککە لەگەڵ یەهودییەکاندا یەکیان گرتووە و هێرش دەکەنە سەر مەدینە.

هەواڵەکە ڕوون و ئاشکرا بوو. بێباوەڕان سوپایەکی گەورەیان کۆکردبووەوە، هەموو هۆزەکانی چواردەوریشیان بانگکردبووە ڕیزەکانیانەوە، بە نیازی ئەوە بوون هێرش بکەنە سەر موسوڵمانەکان. شوێنیان پیشانی هەواڵدەرەکە دا تا بحەسێتەوە. لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ هاوەڵەکانی لە چواردەوری خۆی خڕکردەوە و، ڕاوێژی پێکردن:

- بۆچوونی ئێوە چۆنە؟ ئایا لە دەرەوەی مەدینە لەگەڵ بێباوەڕاندا بجەنگین یان لەناو مەدینەدا بمێنینەوە و بەرگری بکەین؟

دوای ئەوەی هەمووان ڕای خۆیان دەربڕی، "سەلمانی فارسی" بۆچوونی خۆی وت:

- ئەی پێغەمبەری خوا! کاتێك ئێمە لە وڵاتی فارسەکان بووین، هەر کات ترسمان هەبوایە لە هێرشی دوژمن، بە چواردەوری شاردا چاڵ (خەندەق)مان هەڵدەکەند.

ئەم بۆچوونە، هەم لەلایەن پێغەمبەرەوە، هەم لەلایەن هاوەڵەکانەوە پەسەند کرا. بۆیە دەستبەجێ دەستیان کرد بە چاڵ هەڵکەندن بە چواردەوری مەدینەدا.

چاڵ هەڵکەندنەکە بەبێ ڕاوەستان بەردەوام بوو. بەڵام تاشەبەردێکی ڕەقی گەورە لە بەردەم هاوەڵەکاندا بوو بە ڕێگر.

هەرچییەکیان دەکرد، ئەو بەردەیان بۆ نەدەشکا. ناچار، هەواڵیاندا بە پێغەمبەر ﷺ. سەروەرمان ﷺ لە چادرەکەیدا بوو. تەشریفی هێنا بۆلای تاشە بەردەکە. پیکەکەی گرت بە دەستییەوە و لەگەڵ "بسم الله"دا، یەکەم زەبری پیا کێشا.

بەم پیاکێشانە، سێ یەکی بەردەکەی شکاند و، فەرمووی: "الله اکبر، کلیلەکانی شامم پێدرا. سوێند بە خوا ئێستا کۆشکە سوورەکانیان دەبینم." پاشان دانەیەکی تری پیا کێشا و بەشێکی تری تاشە بەردەکەی شکاند و، فەرمووی: "الله اکبر، کلیلەکانی فارسم پێبەخشرا. سوێند بە خوا ئێستا کۆشکە سپییەکانی مەدائین دەبینم." پاشان دوا گورزی لێدا و هەموو بەردەکەی پارچەپارچە کرد و، فەرمووی: "الله اکبر، کلیلەکانی یەمەنم پێبەخشرا. سوێند بە خوا ئێستا دەروازەکانی سەنعا لەبەر چاومن."

تاشە بەردەکە پارچە پارچە بوو، چاڵ هەڵکەندنەکەش زۆر بە خێرایی بەردەوام بوو. لە کۆتاییدا خەندەق لێدرا و موسوڵمانەکان بە ئامادەباشییەوە چاوەڕێی کافرەکانیان دەکرد.

کاتێك بێباوەڕان گەیشتنە مەدینە و چاویان بە چاڵەکە کەوت، زۆر سەرسام بوون، چونکە تەنانەت بەهێزترین ئەسپیش نەیدەتوانی بە باز بپەڕێتەوە ئەوبەری چاڵەکە. بەمجۆرە، شەڕەکە چەندین ڕۆژی خایاند. بە فەرمانی خوای گەورە، بەیانییەکیان ڕەشەبا و زریانێکی خۆلاوی هات و سوپای دوژمنی پەرش و بلاوە پێکرد. سوپاکە پەرتەوازە بوو و ناچار بوون واز لە شەڕکردن بهێنن و ڕابکەن.

* * *

# فەتحی مەککە

بێباوەڕان پابەندی ڕێکەوتننامەکەی "حودەیبییە" نەبوون، کە لەگەڵ موسوڵمانەکاندا بەستبوویان. تەنانەت دوو ساڵیش تێنەپەڕیبوو کە هێرشیان کردە سەر موسوڵمانەکان. ئیتر جام کە پڕ بوو لێی دەڕژێ. ئیتر دەبوایە شارە جوانەکەی مەککە لەلایەن خاوەنە ڕاستەقینەکانییەوە ڕزگار بکرایە. لەو چەند ساڵەی بەرقەرار بوونی ئاشتیدا، نووری ئیسلام بە زۆر شوێندا بڵاوبووبووەوە و ژمارەی موسوڵمانان بێ شومار زیادی کردبوو.

ژمارەی جەنگاوەرانی سوپای ئیسلام خۆی لە دە هەزاردا دەبینیەوە. ئەم جەنگاوەرە موسوڵمانانەی کە سەرتاپا قارەمانێتییان لێدەباری، هاتبوونە نزیك مەککەوە. شەویان لەوێ بەسەر دەبرد.

بە جۆش و خرۆشترین کەسەکانی ناو سوپای ئیسلام، موهاجیرەکان واتە "کۆچکەرەکان" بوون. وا ئیتر ئێستا دەگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی کە چەندین ساڵ لەمەوبەر بە ناچاری دەرکرابوون لێی. لەگەڵ ئەوەشدا بە سەربەرزی و بەوپەڕی بەهێزییەوە دەگەڕانەوە.

ئەبوسوفیان هەواڵی هاتنی سوپاکەی زانیبوو. یەك دوو کەسی لەگەڵ خۆی برد و کەوتە ڕێ. پێغەمبەری خوای دۆزییەوە و تکای ئەوەی لێکرد کە بیبوورێ و چاوپۆشی لە ڕابردووی بکات. ئەبوسوفیان کە ئەو سوپا بێ شومارەی موسوڵمانانی بینی، نەیدەزانی چی بکات. نووری ئیسلام ڕوون و ئاشکرا بوو. ئیتر شایەتومانی هێنا و موسوڵمان بوو.

لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ بە حەزرەتی عەبباسی مامی کە لە پاڵیدا بوو، فەرمووی:

- هیچ زیانێك بەو کەسانە ناگات کە شایەتومان دەهێنن و دەڵێن" جگە لە خوای گەورەی تاك و تەنها، هیچ خوایەکی تر نییە. موحەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە". هەروەها ئەوانەش کە دەچنە ماڵی خۆیان و دەرگا دادەخەن. هەروەها ئەوانەشی چەکەکانیان فڕێ دەدەن و دەڕۆنە لای کەعبە.

حەزرەتی عەبباس خۆی ئامادە کردبوو بڕوات و ئەو قسانە بە دانیشتوانی مەککە ڕابگەیەنێت. پێش ئەوەی بڕوات، بە پێغەمبەری خوای وت:



- ئەی پێغەمبەری خوا! ئەبوسوفیانیش دەیەوێت لەگەڵ من بگەڕێتەوە. ئەگەر ئێوەش چاکەیەکتان لەگەڵ ئەودا بکردایە..!

ئەبوسوفیان چاوی لە زەوی هەڵنەدەبڕی چاوپۆشین لەوەی کە بیکوژن، گەورەترین چاکە بوو لەگەڵ ئەبوسوفیاندا کرابوو. پێغەمبەرمان ﷺ بە دەنگێکی پڕ لە خۆشەویستیی و سۆزەوە ڕووی تێکرد و دڵی فەتح کرد:

- هەروەها ئەوانەش کە دەچنە ماڵی ئەبوسوفیانەوە پارێزراو دەبن.

بۆ ڕۆژی دواتر، سوپای ئیسلام لە هەر چوار لاوە ڕۆیشتە ناو مەککەوە. پێغەمبەرمان ﷺ حاڵەتێکی خاکییانەی هەبوو. ڕاستەوخۆ ڕۆیشت بۆ کەعبە. ئای چەندین ساڵ پێش ئێستا و هەر لەم شوێنەدا چەندە ئازار و ئەشکەنجەی چەشت!

خەڵکی لەناو کەعبەدا کۆبووبوونەوە. لە چاویاندا ئومێدێکی ئاوێتە بە ترس دەبینرا. چونکە هەرچەندە کەسی بەرامبەر لە شوێنی خۆشی دەرکرابێت، بەڵام هەر پێغەمبەری خاوەن سۆز و بەزەیی بوو. خوای گەورە ئەوی وەك ڕەحمەت بۆ هەموو بوونەوەران ناردووە. پێغەمبەر ﷺ بە دەستی خۆی بتەکانی یەکە بەیەکە دا بە زەویدا. ئینجا ڕۆیشتە بەردەم خەڵکەکە و، پرسی:

- ئێوە، وا دەزانن من ئێستا چیتان لێدەکەم؟

ئەوانەی لەوێ بوون، هەموویان بە یەك دەنگ وەڵامیان دایەوە:

- چاکە دەڵێین و چاوەڕوانی چاکەیشت لێ دەکەین. تۆ ئامۆزایەکی زۆر بەڕەحمیت. تۆ زۆر بەهێزیت.

پێغەمبەر ﷺ لەمسەر بۆ ئەوسەر تەماشایەکی کردن، ئەوجا فەرمووی:

- منیش ئەوەتان پێدەڵێم کە حەزرەتی "یوسف" بە براکانی وت: ئەمڕۆ لۆمە و سەرزەنشتتان لەسەر نییە، دەی بڕۆن ئێوە ئازادن!

خەڵکەکە لە بەرامبەر ئەم وتانەدا لە خۆشیاندا دەگریان. دەرگای ماڵەکان یەك بەیەك کرانەوە. هەمووان بە سەربەستی دەهاتنە دەرەوە. پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ فەتحی مەککەدا، دڵی ئەوانیشی فەتح کردبوو. یەك بەیەك شایەتومانیان دەهێنا و موسوڵمان دەبوون. ڕۆژژمێرەکان ساڵی"شەش سەد و سی"یان پیشان دەدا. ئیتر شنەبای خۆشی و شادی بەسەر مەککەدا هەڵی کرد.

*** 

# حەجیماڵئاوایی

پێغەمبەری خۆشەویستمان فەرزی حەجی بەجێ دەهێنا، تەوافی کرد، دواتر لە گردی سەفا دەستی کرد بە پاڕانەوە.

لەم کاتەدا موسوڵمانەکان بەلێشاو دەهاتن بۆ مەککە. لە ماوەیەکی کەمدا ژمارەیان سەد هەزاری تێپەڕاند.

پێغەمبەر ﷺ سواری وشترەکەی بوو. ڕۆیشتە ئەو شوێنەی کە پێیان دەوت عەرەفات. موسوڵمانەکان لەوێ کۆبوونەوە. هەموویان چاویان بڕیبووە لێوە پیرۆزەکانی پێغەمبەر ﷺ و چاوەڕوانی وتەکانیان دەکرد. لە کۆتاییدا سەروەرمان ﷺ دەستی کرد بە وتاردان:

- ئەی خەڵکینە! جوان گوێ لە قسەکانم ڕابگرن! نازانم، بەڵام ڕەنگە لەدوای ئەمساڵەوە نەتانبینمەوە...

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ بە دوورودرێژی قسەی بۆ کردن. باسی زۆر شتی جوانی بۆ کردن. لە کۆتاییدا تەماشایەکی کردن و، فەرمووی:

- سبەی پرسیارتان لێدەکرێت دەربارەی من، ئایا چی دەڵێن؟

بە هەزاران کەس، هەموو بەیەکدەنگ هاواریان کرد و، وتیان:

- ئەڵێین ئەرکەکەی بە تەواوی بەجێگەیاند.

پێغەمبەر ﷺ تەماشایەکی ئاسمانی کرد. ئینجا پەنجەی شایەتومانی بەرزکردەوە و، فەرمووی:

-بەشایەت بە پەروەردگار! بەشایەت بە پەروەردگار! بەشایەت بە پەروەردگار!

دواتر پێغەمبەر ﷺ ئەو ئایەتە پیرۆزەی بۆ خوێندنەوە کە لە لایەن خوی گەورەوە بۆی هات.

﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَـٰمَ دِينًا ۚ ﴾ (المائدة: ٣)

**" ئەمڕۆ ئاین و بەرنامەکەتانم بە کۆتایی گەیاند. ناز و نیعمەتی خۆمم بۆ تەواو کردن. ڕازیم بەوەی کە ئیسلام ببێت بە دین و بەرنامەتان"**

لەو کاتەدا لە نێو قەرەباڵغیەکەدا، کەسێك فرمێسکەکانی پێڕانەگیرا و دایە پڕمەی گریان. ئەو کەسەش جگە لە هاوەڵی نزیکی

پێغەمبەری نازدار، حەزرەتی ئەبوبەکر، کەسی تر نەبوو. حەزرەتی ئەبوبەکر-خوای لێ ڕازی بێت- دەیزانی کە ئیتر ئازیزمان بەجێیان دەهێڵێت. بەڵێ، ئەو حەجە حەجی ماڵئاوایی ئەو بوو.

*** 

# دوا نوێژ

پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ کاتێك تەمەنی موبارەکی "شەست و سێ"ساڵ، ڕۆژێکیان نەخۆش کەوت. ئازارێکی زۆر لە سەری موبارەکیدا پەیدا بوو.

حەزرەتی عائیشە-خوای لێ ڕازی بێت- لە پاڵ سەری پێغەمبەر ﷺ دوورنەدەکەوتەوە. ئەو ئازارانەی کە پێغەمبەر ﷺ دەیچەشت، ئەو لە دڵی خۆیدا هەستی پێ دەکرد. بە بەردەوامی لە خوای گەورە دەپاڕایەوە و دوعای بۆ پێغەمبەری ئازیزمان دەکرد.

نەخۆشییەکەی تا دوو هەفتە بەردەوام بوو. لەو ماوەیەدا ئازارەکانی پێغەمبەر ﷺ هیچ کەمیان نەکرد. جارێکیان نزیك نوێژی خەوتنان لەهۆش خۆی چوو. حەزرەتی عائیشەی دایکمان زۆر دڵگران بوو. دووبارە بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە دەستی کردەوە بە نزا و پاڕانەوە.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ هاتەوە هۆش خۆی، لە حەزرەتی عائیشەی پرسی:

- ئایا جەماعەت دەستیان کردووە بە نوێژ؟

حەزرەتی عائیشە بەدەم شاردنەوەی فرمێسکەکانیەوە وەڵامی دایەوە و، فەرمووی:

- نەخێر، چاوەڕێی تۆ دەکەن.

هاوەڵە بەڕێزەکان بە دڵگرانییەوە چاوەڕێی هاتنی پێغەمبەریان دەکرد تاوەکو نوێژی خەوتنانیان بۆ بکات.

هەموویان چاویان بڕیبووە دەرگاکە. ئومێدێکیشیان هەبوو، دەیانوت ئێستا لە دەرگاکەوە بە زەردەخەنەوە دێتە ژوورەوە و ئەڕواتە پێشیانەوە و بەرنوێژییان بۆ دەکات. چونکە هەموو جارێك وای دەکرد. بەڵام ئەمجارەیان وا نەبوو، ئەو دەرگایە نەکرایەوە.

پێغەمبەری خۆشەویستمان بانگی حەزرەتی عائیشەی کرد و، پێی فەرموو:

- هەواڵ بدەن بە ئەبوبەکر با ئەو نوێژەکەیان بۆ بکات!

حەزرەتی عائیشە لەوە زیاتر خۆی پێنەگیرا و دەستی کرد بە گریان. بە دەم هەنسکەوە وتی:

- ئەی پێغەمبەری خوا! باوکم کەسێکی زۆر دڵناسکە، کاتێك قورئان دەخوێنێتەوە بەردەوام دەگری. ئێستاش هەرگیز دڵی بەرگەی ئەوە ناگرێت بڕواتە شوێنی تۆ و پێشنوێژی بکات!

پێغەمبەر ﷺ جارێکی دیکەش دووپاتی کردەوە:

- هەواڵ بدەن بە ئەبوبەکر با ئەو پێشنوێژییان بۆ بکات!

حەزرەتی عائیشە جارێکی تر هەمان وەڵامی دایەوە. بەڵام پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بڕیارەکەی نەگۆڕی و سەرلەنوێ فەرمووی:

- هەواڵ بدەن بە ئەبوبەکر با ئەو پێشنوێژییان بۆ بکات!

حەزرەتی عائیشە ناچار بوو ئەوە بکات کە پێی وتراوە. جا بۆیە فەرمانەکەی پێغەمبەری خوای گەیاندە باوکی.

حەزرەتی ئەبوبەکر بۆ ماوەیەك نەیزانی چی بڵێت. هەر ئەوەندەی هاتەوە سەر خۆی، بە حەزرەتی عومەر کە لە تەنیشتییەوە بوو، فەرمووی:

- ئەی عومەر! ئەگەر تۆ نوێژەکەت بکردایە...

حەزرەتی عومەر-خوای لێ ڕازی بێت- سەری ڕاوەشاند و، فەرمووی:

- نەخێر، ئەی ئەبوبەکر تۆ لە من شیاوتری بۆ ئەم کارە.

پاش کەمێك نوێژ دەستی پێکرد. حەزرەتی ئەبوبەکر بە دەنگە خەمناکەکەیەوە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی دەخوێندەوە. پێغەمبەریش ﷺ لەودیوەوە گوێی لێ ڕاگرتبوو.

لەم کاتەدا حەزرەتی ئەبوبەکر و هاوەڵەکانی دواوەی و حەزرەتی عائیشەش هەموو دەگریان...

***

# بەیەك گەیشتنەوە

دوو شەممە بوو، نەخۆشییەکەی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ زۆر سەخت بووبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە هیچ جۆرێك سکاڵای نەدەکرد. هەوڵی دەدا ئارام بگرێت، لە خوای گەورە دەپاڕایەوە:

- ئەی پەروەردگاری میهرەبان! ئازارەکانم لەسەر سووك بکە. شیفام پێ ببەخشە. چونکە شیفا بەخشی ڕاستەقینە هەر تۆیت. تەنها تۆیت بەندەکانت لە ناخۆشی ڕزگار دەکەیت!

ماوەیەك وا هەستی کرد کە تەندروستی باش بوو خێرا هەستایە سەر پێ. ڕوخساری مویارەکی بەهۆی کاریگەری نەخۆشییەکەیەوە سپی هەڵگەڕابوو.

بە ناڕەحەتی هەنگاوی نا و، لە دەرگاکەوە تەماشایەکی مزگەوتەکەی کرد. لەگەڵ هاوەڵاندا چاویان بەیەك کەوت. نیگاکانی،

دڵی هاوەڵەکانی نوقمی شادی و کامەرانی کرد. زۆر زۆر دڵخۆش بوون بەوەی کە بینیان وا پێغەمبەر ﷺ بە پێوەیە.

حەزرەتی ئەبوبەکر خێرا شوێنی بەرنوێژییەکەی جێهێشت. ڕۆیشتە ئەو لاوە و فەرمووی لە پێغەمبەر کرد ﷺ، هەمووان ئومێدی ئەوەیان دەکرد کە پێغەمبەر نوێژەکە بکات.

پێغەمبەر ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد و چاوی بڕییە چاوی هاوەڵانی و، فەرمووی:

- دەی نوێژەکەتان تەواو بکەن!

دواتر گەڕایەوە دواوە و چووەوە ژوورەکەی خۆی. لەسەر ئەو جێگایەی کە تۆزێك لەمەوبەر لەسەری هەستابوو، ڕاکشایەوە. ئیتر دووبارە هەوری پەژارە، خۆری شادی دڵی هاوەڵە بەڕێزەکانی داپۆشیەوە.

پێغەمبەری ئازیز ﷺ بەردەوام هەمان دوعای دووبارە دەکردەوە و، دەیفەرموو:

- ئەی پەروەردگاری میهرەبان! ئازارەکانم لەسەر سووك بکە. شیفام پێ ببەخشە. چونکە شیفا بەخشی ڕاستەقینە هەر تۆیت. تەنها تۆیت بەندەکانت لە ناخۆشی ڕزگار دەکەیت!

حەزرەتی عائیشە لای سەری پێغەمبەرەوە بوو. بۆ ساتێکیش چاوەکانی لەسەر لانەدەبرد. دەستی پیرۆزی پێغەمبەری گرت. نەخۆشییەکەی زۆر سەخت بووبوو. کەمێك بەجۆرە مانەوە. پاشان

حەزرەتی عائیشە دەستەکانی بەرزکردەوە بۆ ئەوەی لە خوای گەورە بپارێتەوە کە شیفای پێغەمبەر بدات. بەڵام پێغەمبەر ﷺ دەستی کێشایە دواوە و، بە هێواشی کۆتا وتەی فەرموو:

- پەروەردگارا، لێم خۆش بە! ئیتر دەمەوێ بە دۆستی ڕاستەقینە شاد ببمەوە!

ئیتر بەمجۆرە پێغەمبەری ڕەحمەت بۆ جیهانیان ﷺ بە دیداری پەروەردگاری مەزن شاد بووەوە.

****

## خەم

هەواڵی کۆچی پێغەمبەر ﷺ وەك ئاگرێك دڵەکانی سووتاند. هاوەڵەکان نەیاندەزانی چی بکەن، کەسیان قسەیان لە دەم نەدەهاتە دەرەوە. هەمووی لە شوێنی خۆی وشك بووبوو. حەزرەتی عومەر چاوی بڕیبووە بۆشاییەك و بەو شێوەیە وەستابوو. حەزرەتی عوسمان کەوتبووە سەر زەوی و هەروا مابووەوە. حەزرەتی عەلی هێندە لە حاڵێکی خراپدا بوو، دەتوت دنیای بەسەردا ڕووخاوە. دوای ماوەیەك حەزرەتی عومەر هەستایە سەر پێ، شمشێرەکەی لە کێلانەکەی دەرهێنا و بە چاوە تیژەکانیەوە چاوی گێڕا بەسەر ئەوانەی لەوێدا بوون. ئینجا بە هەموو هێزییەوە هاواری کرد:

- ئەوەی بڵێت "پێغەمبەری خوا مردووە!" ملی دەپەڕێنم.

کەسیان لە حاڵێکی وەهادا نەبوون کە گوێیان لە قسەکانی ئەو بێت. هەمووویان وەك کەسێکی وشك بوو چاویان بڕیبووە خاڵێك. بەبێ جووڵە بە پێوە وەستابوون .حەزرەتی ئەبوبەکر ڕۆیشتە ژوورەوە. پێغەمبەری خۆشەویستمان لە پارچە قوماشێکی یەمەنییەوە ئاڵێندرابوو. حەزرەتی ئەبوبەکر پەڕۆکەی سەر دەموچاوی کەمێك لابرد و ماوەیەك بەو شێوەیە مایەوە. کە لە دەموچاوی نوورانی پێغەمبەری دەڕوانی، بە دەنگێکی لەرزۆکەوە چەند وشەیەکی لەبەرخۆیەوە وت:

- کە لە ژیاندا بویت جوان بوویت، ئێستاش کە کۆچت کردووە هەر جوانیت!

ئینجا دەستی کرد بە ماچ کردنی دەموچاوی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ و قوڵپە قوڵپی گریانی دەهات. بەدەم هەنسکی گریانەوە، ئەم وتانە لە زاری هاتنە دەر:

-دایك و باوکم بە قوربانت بن! وەڵڵاهی خوای گەورە دوو جار تۆ نامرێنێ. تۆ ئەو مردنەت چەشت کە لەسەرت بوو.

لەم کاتەدا لە دەرەوە دەنگی حەزرەتی عومەر دەهات کە دەیوت:

- وەڵڵاهی پێغەمبەر نەمردووە! پێغەمبەری خوا نەمردووە!

حەزرەتی ئەبوبەکر بە ئارامی هەستایەوە. بە هێواشی ڕۆیشتە دەرەوە. تەماشایەکی موسوڵمانەکانی کرد. ئینجا ڕوویکردە حەزرەتی عومەر و، فەرمووی:

- دانیشە ئەی عومەر!

بەڵام لەو کاتەدا حەزرەتی عومەر ئاگای لەخۆی نەبوو. تەنانەت گوێیشی لە وتەکانی حەزرەتی ئەبوبەکر نەبوو. حەزرەتی ئەبوبەکر ڕووی کردە موسوڵمانەکانی ئەوێ و، فەرمووی:

- ئەی خەڵکینە! کێ ئیمانی بە موحەممەد هێناوە، با بزانێت کە ئەو مردووە! هەر کێش خوای گەورە دەپەرستێت، ئەوا با بزانێت خوای گەورە زیندووە و هەرگیز نامرێت!

حەزرەتی عومەر خەریك بوو دەهاتەوە سەر خۆی، هێزی لەبەر بڕابوو. ئینجا حەزرەتی ئەبوبەکر وتەکانی بە ئایەتێك لە قورئانی پیرۆز کۆتایی پێ هێنا:

﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ﴾ (ال عمران : ١٤٤)

**" موحەممەد تەنها پێغەمبەرێکە. لە پێش ئەویشەوە پێغەمبەر هاتوون و ڕۆیشتوون. ئێستا ئەگەر ئەو بمرێت یان بکوژرێت ئایا ئێوە دەگەڕێنەوە سەر شێوازەکەی پێشوتان؟"**

حەزرەتی عومەر هەر کە ئەم ئایەتەی بیست، یەکسەر کەوتە سەر زەوی و لەهۆش خۆی چوو. کە هۆشی هاتەوە ئارام بووبووەوە.

موسوڵمانەکان ناچار بوون کە ئەو ڕاستییە قبووڵ بکەن. لە کۆتاییدا پێغەمبەری خۆشەویستیشمان مرۆڤێك بوو. وەکو هەموو خاوەن ڕۆحێکی تر، ئەویش کۆچی دوایی دەکرد. ئەوەی کە "نەمر"ە تەنها خوای گەورەیە.

بۆ ئەوەی پێغەمبەری خۆشەویستمان بەخاک بسپێرن، هاوەڵان کەوتنە جووڵە. لە پێش هەموویانەوە حەزرەتی عەلی لەگەڵ چەند کەسێکی تر جەستەی موبارەکی پێغەمبەریان شوشت. بە سێ چین قوماش دایان پۆشی و بە قوماشی یەمەنی کفنیان کرد.

لەم کاتەدا مشتومڕێك پەیدا بوو. نەیاندەتوانی بڕیار بدەن کە پێغەمبەر ﷺ لە کوێدا ئەسپەردەی خاك بکەن. هەر کەسەو ڕای جیاوازی هەبوو. حەزرەتی ئەبوبەکر ڕۆیشتە پێشەوە و، فەرمووی:

- من لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوومە کە: هەموو پێغەمبەران لەو شوێنەدا بە خاك دەسپێردرێن، کە گیانیانی تێدا دەسپێرن. بەمجۆرە دەنگە دەنگەکە تەواو بوو. خێرا لەوێدا مەزاری پێغەمبەری خوایان هەڵکەند. زۆری پێ نەچوو جەستەی موبارەکی ئەسپاردەی خاك کرا.

***

# حەزرەتی

# محمد

## صلی اللە علیە وسلم

ئەستێرەکان لە ئاسمانەوە داباریینە
سەر زەوی... جیاوازییەك لەو شەوەدا هەبوو.
ئەو مژدەیەی چەندەها ساڵە چاوەڕوانیی
دەکرێت، ئەو بەیانییە لە دایك بوو. بە لەدایك
بوونی ئەو ، کۆشکەکانی کیسرا ڕووخان.
ئەو ئاگرەی چەندین ساڵ بوو دەسووتا،
بە جارێك کوژایەوە. دەریاچەی ساوەش
وشك بوو.ئەو ڕۆژە پێغەمبەری
ئازیزمان ـ صلی الله علیه وسلم ـ لە دایك بوو.
ئەو بە دادپەروەری و ئاکاری جوانی
بووە نموونە و سەرمەشق بۆ سەرجەم
مرۆڤـایەتی.







نرخ ٤٠٠٠ دینارە